بنەماکانی ڕێزو ڕەوشت

# چیرۆکە خۆشەکان



## کۆمەڵێك چیرۆکی جیهانی هەڵبژاردە










وەرگێڕانی: مامۆستا دیار ئەسعەد

# چیرۆکە خۆشەکان

## کۆمەڵێك چیرۆکی جیهانی هەڵبژاردە



07701918565 - 07501571818

چاپ و بلاوکردنەوە

**ناوی کتێب:** چیرۆکەکانی منداڵی زیرەك

**وەرگێڕانی:** مامۆستا دیار ئەسعەد

**نۆبەتی چاپ:** چاپی سێهەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە

گتییەکان ژمارەی سپاردنی (١١٦٧) پێدراوە



# چیرۆکی ماشا و ورچەکە

هەبوو نەبوو پیرە پیاو و پیرە ژنێک لە لادێیەکدا دەژیان و کچەزاکەشیان لەگەڵ بوو کە کچێکی وردیلە و جوان بوو ناوی ماشا بوو، رۆژێکیان هاورێکانی ماشا بڕیاریان دا بچن بۆ دارستان بۆ کۆکردنەوەی قارچک و توو، بۆ ئەو مەبەستە هەموو هاورێکانی بڕیاریان دا بچن بۆ لای نەنک و باپیرەی تا کو رێگە بە ماشا بدەن تا لەگەڵیان بچێت بۆ دارستان. تکایە باپیرە .... تکایە داپیرە گیان رێگەم بدەن لەگەڵ هاورێکانم بچم بۆ دارستان زۆر حەزئەکەم، ماشا لە باپیرە و داپیرەی پاڕایەوە تا رێی بدەن. باپیرە و داپیرەی ماشا ئەوەندە ماشایان خۆش دویست دڵیان نەدەهات دڵی بشکێنن و رێیان دا لەگەڵ هاورێکانیدا بچێت بەڵام داواشیان کرد کە زۆر ئاگای لە خۆی بێت. دواتر ماشا



و هاوڕێکانی بەرەو دارستان بەرێکەوتن بۆ کۆکردنەوەی قارچک و توو دەستیان کرد بە گەڕان لەم دەوەن بۆ ئەو دەوەن لەم دار بۆ ئەو دار بە خۆشیەوە دەگەڕان، ماشا لە تەماحی ئەوەی زۆرتر کۆبکاتەوە لە هاوڕێکانی وون بوو و بەتەنیا مایەوە، هەرکە زانی بە تەنیا ماوەتەوە و هاوڕێکانی بەجێیان هێشتووە دەستی کرد بە بانگ کردنی هاوڕێکانی و پڕ بە دارستانەکە هاواری دەکرد بەڵام کەس جوابی نەدایەوە و گوێیان لێینەبوو. ماشا زۆر گەڕا لەملا بۆ ئەولا بەڵام بێ سود بوو نەیتوانی هاوڕێکانی بدۆزێتەوە هەموو دارستانەکە گەڕا تا لە شوێنێکا کووخێکی بچووکی دۆزییەوە ماشا لە درگای دا بەڵام کەس دەرگاکەی نەکردەوە دوای تۆزێک چاوەڕێ کردن ماشا پاڵێکی نا بە دەرگای کووخەکەوە و دەرگاکە کرایەوە دواتر چووە ژوورێ بەڵام کەسی لێنەبوو، بۆ پشودان لەسەر کورسیەک لەبەردەم پەنجەرەکەیا دانیشت و لەبەر خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە دەیووت: تۆ بڵێی کێ لەم کووخەدا بژێت؟ لەم بیرکردنەوەیەدا بوو وورچێکی گەورە



خۆی کرد بە کووخەکەیا کە پێدەچوو ئەو کووخە ماڵی وورچەکە بێت، کاتێک وورچەکە ماشای بینی زۆر دڵی خۆش بوو، وورچەکە بە خۆشحاڵیەوە بە ماشای ووت: هەرگیز رێت پێنادەم لەم کووخە بچیتە دەرەوە وەکو کچێکی گوێڕایەڵ نانی بەیانی و ئێوارەم بۆ ئامادە بکە و ببە بە خزمەتکارێکی بەوەفا و ڕاستگۆی من. ماشا بۆ ماوەیەکی زۆر بێتاقەت بوو بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو بۆیە بەناچاری لەگەڵ وورچەکەدا مایەوە و ماڵەکەی بۆ بەڕێوە برد، هەموو رۆژێک پێش ئەوەی وورچەکە کووخەکە بەجێبهێڵێ بە ماشای دەوت نەڕوات و لە کووخەکەدا بمێنێتەوە هەرگیز بیرلەوە نەکەیتەوە بێ من بچیتە دەرەوە ئەگەر شتێکی وا بکەیت ئەوا ئەتگرم و یەکسەر ئەتخۆم. ماشاش زۆر بیری نەنک و باپیرەی دەکرد بۆیە بیری لە رێگایەک دەکردەوە تاکو لە وورچەکە ڕزگاری بێت بەڵام نەیدەتوانی ڕابکات چونکە شارەزای دارستانەکە نەبوو و دەترسا وون ببێت. هەموو رۆژێک لەبەردەم پەنجەرەی کووخەکەدا دادەنیشت تاکو کەسێک بەوێدا



تێپەڕ بێت و پرسیاری ڕێی لادیکەی خۆیانی لێبکات بەڵام کەسی نەدەبینی بۆیە بیری کردەوە و بیریکردەوە تا بیرۆکەیەکی لە مێشکدا درووست بوو بۆیە بە وورچەکەی ووت: وورچەکە من دەمەوێت بۆ تەنها ڕۆژێکیش بێت بچمەوە بۆ لادێکەمان و هەندێک شت بەرم بۆ نەنک و باپیرم تاکو بیخۆن، وورچەکە وەڵامی دایەوە و ووتی: نا ... نا.... ئەوە هەرگیز نابێت وون دەبیت لە دارستانەکە بەڵام ئەگەر خواردنەکان بدەیت بەمن ئەوا من دەیبەم بۆیان. قسەکانی وورچەکە هەمان ئەو شتانە بوو کە ماشا دەیویست بیبیستێ هەر بۆیە کولێرەیەکی گەورەی دروست کرد و خستیە سەرقاپێک و سەبەتەیەکی گەورەی هێنا و کولێرەکەی تێکرد و بە وورچەکەی ووت: کولێرەکەم خستۆتە سەبەتەکەوە و ئامادەیە تا بیبەیت بۆیان بەڵام بیرت بێت نابێت سەبەتەکە بکەیتەوە و کولێرەکەش بخۆیت من ئەچمە سەر دار بەرزو و چاودێریت دەکەم ئاگام لێت دەبێت تاکو



سەبەتەکە نەکەیتەوە، وورچەکەش بەڵێنی پێدا کە سەبە تەکە نەکاتەوە و کولێرەکەش نەخوات بەڵام پێش ئەوەی بەرەو لادێکە بکەوێتە رێ وورچەکە چووە دەرێ تاکو دڵنیا بێت لەوەی کە باران نابارێت هەرکە ئەو چووە دەرەوە ماشا بە فرسەتی زانی و خۆی خستە ناو سەبەتەکەوەو لە ژێر کولێرەکەدا خۆی شاردەوە. وورچەکە هاتە ژوورەوە و هەموو شتێک ئامادەبوو سەبەتەکەی دا بە کۆڵیا و بەڕێکەوت و بە تەپە تەپ وورچەکە دەستی کرد بە رۆشتن بەسەر گردی بەرزدا سەرکەوت و بە دۆڵی نزمدا هاتە خوارێ تا ئەو کاتەی هەستیکرد کە ماندوو بوو پێویستە بحەوێتەوە لە شوێنێکدا دانیشت و ووتی: ئەگەر دانەنیشم و ئێسکەکانم نەحەوێتەوە ئەوا دەمرم، بۆیە لەسەر بنە دارێک دانیشت و نیازی وابوو کولێرەکە بخوات، ماشا زانی کە وورچەکە دەیەوێت سەبەتەکە بکاتەوە و کولێرەکە بخوات لە ناو سەبەتەکەوە هاواری کرد و ووتی:



نەکەی .... کولێرەکە بخۆیت من دەتبینم نەکەی بیخۆیت ئەو کولێرەیەم بۆ نەنک و باپیرەم درووست کردووە. وورچەکە ووتی: چەند چاوێکی تیژی هەیە ماشا هەموو شتێک دەبینێت» بۆیە سەبەتەکەی هەڵگرتەوە و دەستی کردەوە بە رۆشتن، پاش ماوەیەک لە رۆشتن دیسانەوە هەستی بە ماندووی کردو دانیشت بۆ ئەوەی بحەوێتەوە و ووتی: ئەگەر پشوو بە ئێسکەکانم نەدەم ئەوا دەمرم بۆیە با کولێرە بخۆم تەواو دوو کەوتومەتەوە ماشا ناتوانێ لێرە بمبینێ، دیسان ماشا لە ناو سەبەتەکەوە هاواری کرد: چاوم لێتە نەکەی کولێرەکە بخۆیت ببیە بۆ نەنک و باپیرم من بۆ ئەوانم درووست کردووە، وورچەکە سەری سوڕما و ووتی: ئەم کچە چەند زیرەکە لەسەر دارێکی بەرز دانیشتووە و زۆر دوورە لێمەوە بەڵام هەموو شتێک ئەبینێ و هەموو شتێک ئەبیستێ. بۆیە جارێکی تر بە ناچاری دەستی کردەوە بە رۆشتن و بەڵام ئەمجارە خێراتر لە جاری پێشوو تا گەیشتە



لادێکە و بەدوای ماڵی نەنک و باپیری ماشادا گەڕا تا دۆزییەوە لە دەرگای دا و هاواری کرد، دەرگاکە بکەنەوە من هەندێک شتم لە ماشاوە بۆ هێناون، بەڵام سەگەکانی لادێکە وورچەکەیان ترساند و دەیانویست پەلاماری بدەن خۆیان لە وورچەکە گیڤ دەکردەوە و پێی دەوەڕین وورچەکە زۆر ترسا و بۆیە سەبەتەکەی لەبەردەم دەرگاکەدا دانا و تا لە توانایدا بوو رایکرد بێ ئەوەی سەیری دواوە بکات، پیرە پیاو و پیرە ژن دەرگاکەیان کردەوە و سەبەتەکەیان بینی پیرێژنەکە ووتی: دەبێ ئەم سەبەتەیە چی تێدا بێت؟ پیرە پیاوەکەش سەبەتەکی هەڵگرت و سەیری کرد و نەیتوانی بڕوا بە چاوەکانی بکات کاتێک بینی ماشا لەناو سەبەتەکەدا بەسەلامەتی دانیشتووە، نەنک و باپیری زۆر دڵخۆش بوون بە گەڕانەوە کچەزا جوانەکەیان بۆیە بە پەرۆشەوە ماشایان لەباوەش گرت و ماچیان کرد و بە ماشایان ووت: تۆ زۆر زیرەکیت کە توانیوتە لە دەست ئەو وورچە ڕزگارت بێت.



# چیرۆکی ژیانی کایۆ

کایۆ منداڵێکی زۆر ڕوح سوک و گوێڕایەڵە کە خولیایەکی زۆری هەیە بۆ گەشت کردن و تاقیکردنەوەی شتی نوێ، ئەو حەزی زۆری هەیە بۆ گەڕان بە کەشتی و فڕۆکە. ئەو هەمیشە خەون دەبینێت بە شتەکانەوە، ئەو چەندین خەونی هەیە. کایۆ پەیوەندییەکی باشی هەیە لەگەڵ دایک و باوک و ئەندامانی خێزانەکەی. کایۆ مامۆستاکانی زۆر خۆش دەوێت، هەمیشە ئامۆژگارییەکانیان لە گوێ دەگرێت. کایۆ هاوڕێی گیان لەبەرانە، دایناسۆرەکەی و پشیلە و سەگەکەی زۆر خۆش دەوێت کە ناوی دایناسۆرەکەی ڕۆکسییە، ورچە بووکەڵەکەی کە ناوی تێری یە و، پشیلەکەشی کە ناوی گیلبێرتە، هەموویانی زۆر خۆش دەوێت، هەمیشە مایەی خۆشحاڵی دایک و باوکێتی، چونکە بەجۆرێک گوێڕایەڵیان دەکات کە دڵی ڕازی کردوون، کایۆ بۆتە جێی شانازی دایک و باوکی، پێویستە ئێوەی منداڵانیش لە قسەی دایک و باوکتان



دەرنەچن و هەموو ئەو شتانەی لە ژیاندا بەدەستی دەهێنن دەبێت خۆشتان بوێت، ڕێزی دراوسێکانتان بگرن.

## دایکی کایۆ

کایۆ خاوەنی دایکێکی میهرەبانە، دایکان هەموویان جوانن، خۆشەویستن، ئێمە لەژیانماندا قەرزاری دایکمانین، دایکی کایۆ زۆربەی کاتەکان زۆر سەرقاڵە بە ئیشی ناوماڵەوە و کاتەکانی تریشی لە ئۆفیسەکەی کە کاری تێدا دەکات بەسەر دەبات. کایۆ هەندێک کات یارمەتی دایکی دەدات لە کاری ڕۆژانەیدا، زۆربەی کات لە چێشتخانەکەدا یارمەتی دایکی دەدات لە چێشت لێناندا. وەکو نان کردن و هەندێک کاری ماڵ پاککردنەوە و کایۆ دایکی زۆر خۆش دەوێت. دایکیشی کایۆی زۆر خۆش دەوێت و زۆربەی کاتەکانی هەوڵی فێرکردنی کوڕە شیرینەکەی دەدات، دیاری جوانی بۆ دەکڕێت. هەمیشە گرنگی بە هەڵسوکەوتەکانی کایۆ دەدات.



# باوكی كایۆ

باوك ئەو پیاوەی كە هەموو تەمەنی بۆ خزمەتكردنی ئێمە تەرخان كردووە، كارمان بۆ دەكات و خۆی ماندوو دەكات لەپێناوی خۆشگوزەرانی ئێمە، باوكی كایۆ زۆربەی كات لە پرۆژەكانی چواردەوری ماڵەكەیان كار دەكات، لەناو باخەكەیاندا گوڵ و ڕووەكی جوان دەڕوێنێت، كایۆ فێری ڕەوشت بەرزی دەكات، ئەو زۆربەی كاتەكان بەوە دەناسرێ كە بلوزێكی سەوزی لەبەردایە. هەروەها باوكی كایۆ زۆر حەزی لە یاری دووگۆڵیشە، هاوڕێیەكی نزیكی كایۆ كوڕێتی و باوكێكی زۆر باشە بۆی، كایۆی فێری چەندین یاری و وەرزشی خۆش كردووە.



# کایۆ و خوشکە خنجیلانەکەی

ڕۆزی ناوی خوشکە خنجیلانە جوانکیلەکەی کایۆیە، هەموو ماڵێک کە پێی دەوترێت خێزان لە چەند ئەندامێک پێک دێن، ئەندامانی ماڵی کایۆ لە باوک و دایک و باپیرە و داپیرەو ڕۆسی خنجیلە پێک هاتوون، ڕۆسی هەمیشە حەز دەکات کە لەگەڵ کایۆ بێت و لاسایی کارەکانی بکاتەوە. ڕۆزی زۆر زیرەک و نازدارە، خاوەنی دەنگێکی هێمنە و لەسەرخۆیە، کایۆ زۆر هاوکاری دەکات، ئەو شتانەی کە دایک و باوکی فێری کایۆیان کردووە ئەویش فێری خوشکە بچوکەکەی دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی ڕۆزی تەمەنی لەکایۆ کەمترە و نەچۆتە قوتابخانە، زۆر زۆر حەزی لەقوتابخانەیە، بۆیە هەرکاتێک کایۆ لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە، هەموو ئەو شتانەی مامۆستاکانی بۆی باسکردوون بۆ ڕۆسیشی دەگێڕێتەوە، هەندێک جاریش لەگەڵ کایۆی برایدا شەڕ و



دەمەقاڵێ دەکات، بەڵام ئەمە ماناى ئەوە نییە کە ڕقى لە براکەیەتى، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو براکەى خۆى زۆر خۆش دەوێت. زۆر زوو کێشەکانیان کۆتایى پێدێنن و وەک دوو منداڵى بەڕەوشت هەڵسوکەوت دەکەن. کایۆ بە بەردەوامى یارى لەگەڵ خوشکە بچوکەکەى دەکات و هەرگیز پشتگوێى ناخات و هەمیشە بۆ دەرەوە لەگەڵ خۆى دەبات. کاتێک ئازارى پێدەگات کایۆ دەچێتە لاى و ژیرى دەکاتەوە، ڕۆزى کایۆى زۆر خۆش دەوێت، کاتێک کایۆ دەچێت بۆ جێگایەک، ئەگەر نەیبات ئەوا دەگرى، بۆیە کایۆ دەچێت بۆلاى خوشکە خنجیلانە بەنازەکەى و فرمێسکەکانى دەسڕێت و داواى لێبوردنى لێ دەکات و ژیرى دەکاتەوە.

کایۆ ئەوەى زانیوە و لە دایک و باوکییەوە فێربووە کە دەبێت خوشکە بچوکەکەى خۆش بوێت، هەر داواکارییەکى لێى هەبوو بۆى جێبەجێ بکات، بۆیە زۆربەى کات ڕۆسى خوشکى لەگەڵ خۆى دەگەڕێنێت.



# داپیرەی کایۆ

وەک چۆن ئێمە دایک و باوکمان هەیە، ئەوا دایک و باوکانیشمان دایک و باوکیان هەیە کە پێیان دەوترێت با و باپیران، داپیرەی کایۆ ژنێکی بەتەمەنی زۆر چالاکە و پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ کایۆ هەیە، ئەو زۆر حەزی لە کاری هونەری و چوونە دەرەوە هەیە. هەروەها زۆرجار بیرۆکەی زۆر باش دەداتە کایۆ لە کارەکانیدا و یارمەتی کایۆ دەدات لە چارەسەرکردنی کێشەکانی، کایۆ بە چاوێکی ڕێزەوە سەیری داپیرەی دەکات و گوێ لە ئامۆژگارییەکانی دەگرێت و وەک ژنێکی دنیادیدە سەیری دەکات و ئامۆژگاری منداڵانیش دەکات کە سود لە ئامۆژگارییەکانی داپیرەیان وەربگرن و هەمیشە گوێڕایەڵیان بن بۆ ئەوەی لە



ژیاندا خۆشەویست و سەرکەوتوو بن، دەبێت هەموومان لە ئامۆژگارییە بەسودەکانی گەورەکانی خێزانەکانمان دەرنەچین. دایک و باوکی کایۆ ئامۆژگارییان کردووە لەماڵەوە کاتێک داپیرە کار دەکات، دەبێت هاوکاری بکات، چونکە داپیرە پیر بووە و پێویستی بە هاوکاری ئەوە، کایۆ ئەم ئامۆژگارییە بەباشی لە گوێ گرتووە و جێبەجێی دەکات، داپیرەش کایۆ فێری چەندین کاری جوان دەکات، بۆئەوەی لە داهاتوودا کە گەورە بوو کەسێکی زۆر باشی لێ دەربچێت. کایۆ و داپیرە و خوشکە بچوکەکەی و باپیرە و دایک و باوکی لە یەک ماڵدا دەژین. خێزانێکی خنجیلەی بەختەوەریان پێک هێناوە. زۆرجار بانگی خزم و کەسوکارەکەیان دەکەن و میوانداریان دەکەن، لەکاتی هاتنی میوانەکاندا کایۆ زۆر ڕێزی میوانەکان دەگرێت، لەکاتی میوانداریەکاندا ناگری و کاری خراپ ناکات، بەبێدەنگی دادەنیشێت و گوێیان لێدەگرێت هەتا زیاتر فێر بێت.



# کایۆ و بابە گەورەی (باپیرە)

باپیرەی کایۆ زۆر حەز دەکات کە لەگەڵ کایۆ بێت و لەگەڵیدا بگەڕێت، باپیرەی کایۆ نەوەکانی خۆش دەوێت، ئەو باوکی کایۆی زۆر بەجوانی پەروەردە کردووە، حەزیش دەکات کایۆ بەهەمان شێوەی باوکی ئازاو زیرەک و بەڕەوشت بێت، هەمیشە چیرۆکە مێژووییەکانی بۆ دەگێڕێتەوە و زۆر حەز دەکات کە کایۆی نەوەی خوێندەوار و سەرکەوتوو بێت، کایۆش زۆرجار لەگەڵ باپیری بە پاس لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تری شار دەگەڕێت و شوێنی نوێ دەبینێت. باپیری کایۆ هەندێک شوێنی نهێنیش پیشانی کایۆ دەدات لە پشتی باخچەکەیان. هەروەها کایۆ زۆر حەز دەکات کە باپیری چیرۆکی بۆ بگێڕێتەوە و باپیرەشی ئەم حەزەی کایۆی نەوەی خۆشەویستی لەیاد نەکردووە، ئامۆژگارییەکانی باپیرەی زۆرە بۆ کایۆ، لە گرنگترینیان ئەوەیە کە



نابێت هەرگیز تانە و وشەی ناشیرین بەرامبەر هاوڕێکانی بەکار بێنێت و حەز دەکات کایۆ بە بەردەوامی کتێب بخوێنێتەوە. ڕۆژێک لەڕۆژان باپیرەی کایۆ دەباتە دەرەوە بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر بەلەم پێ بدات، کایۆی بردە بەردەم ڕووبارێک بەلەمێکی بچوکی کڕیبوو، دایە دەستی کایۆ و وتی: کوڕم کایۆ دەتوانیت ئەم بەلەمە بخەیتە ناو ئاوەکە و یاری پێ بکەیت؟

کایۆ وتی: باپیرە ئەی نقومی ئاوەکە نابێت؟

باپیرەی کایۆ وەڵامی دایەوە و وتی: نەخێر بەلەم وا دروست کراوە کە نوقمی ئاو نابێت. کایۆ لە باپیرەی پرسی: ئەم بەلەمە بۆچی بەکار دێت؟

باپیری وەڵامی دایەوە و وتی: بەلەم بۆ گەشت و گوزار و گەڕان لەسەر دەریاکان و گواستنەوە بەکار دەهێنرێت و کارئاسانییەکی زۆر باشە بۆ مرۆڤەکان.

کایۆ لە باپیرەی پرسی: ئایا منیش دەتوانم سواری بەلەم بم؟

باپیرەی کایۆ بەڵێنی بە کایۆ دا کە ڕۆژێک لەڕۆژەکانی پشوو بیبات بۆ دەریاچەکە و گەشتێکی لەسەر بەلەم بۆ ڕێک بخات.



# کایۆ خەڵکی کوێیە؟

کایۆی جوان و خۆشەویست خەڵکی وڵاتی فەڕەنسایە کە وڵاتێکە دەکەوێتە کیشوەری ئەوروپاوە، وڵاتێکی خۆش و جوانە وەک بەهەشتی سەرزەمینە، ئامۆژگارییەکانی کایۆ کاریگەری زۆر قووڵی کردۆتەوە لەسەر منداڵ و ڕەفتاری منداڵ. هەروەها ئەو چەندین بیرۆکەی زۆر جوانی لەسەر ڕەفتاری منداڵ هەیە و لە شێوەی نووسین و چیرۆکدا خستوونیەتە ڕوو.



# کایۆ چۆن دەژی؟

کایۆ هەمیشە بەڕەفتارە جوان و لەسەرخۆکانی سەرنجی هەموو لایەکی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە، کایۆ بۆتە مایەی شانازی دایک و باوکی، کایۆ بەبێ پرس و سەربەخۆ دەست بۆ هیچ شتێک نابات، لەگەڵ باوک و دایکی هێمنە و گوێڕایەڵی داپیرە و باپیرەیەتی، لەکاتی چوونی بۆ بازاڕکردن لەگەڵ دایک و باوکی هەرگیز بیانوو ناگرێت و داوای شتی خراپ و بێکەڵک ناکات. سەرەڕای ئەوەی کە خودای گەورە هەر لە منداڵییەوە سروشتی دروستکردنی کایۆی وا کردووە کە قژی نییە، بەڵام ئەو زۆر دڵخۆشە و ئەو کارە



سروشتییەی خودای گەورەی پێ ناخۆش نییە و بە دڵێکی پڕ هیواوە دەژی، هەرگیز خۆی خەمبار ناکات و خۆی لە کۆمەڵگاکەی جیا ناکاتەوە، هەمیشە پێی وایە کە دەبێت ڕێز لە مرۆڤەکان بگیرێت، ئەگەر هەر شێوازێکیان هەبێت لە ڕوخسارياندا. کایۆ لەماڵەوە ژووری تایبەتی خۆی هەیە بۆ نوستن و لە هیچ شتێک ناترسێت. ئازایانە شەوان بەتەنیا لە ژوورەکەی خۆی زوو دەخەوێت و بەیانیان زوو هەڵدەستێت لە خەو، ئەم کارەشی وای لێکردووە کە منداڵێکی تەندروست بێت. کایۆ پارێزگاری لە کەلوپەل و شتومەکەکانی ناو ژووری خەوتنەکەی دەکات و ڕێزیان لێ دەگرێت و هەمیشە بەخاوێنی ڕایاندەگرێت، لە ژووری خەوتنەکەی هەرگیز سەیری تەلەفزیۆن و هیچ ئامێرێکی تر ناکات لەبەر ئەوەی ئەو ژوورە تەنها بۆ خەوتن کراوە، کایۆ بەباشی ئامۆژگارییەکان لە گوێ دەگرێت لەبەر ئەوەی کە گەورە بوو کەسێکی بەڕێزی لێ دەربچێت و جێگای ڕەزامەندی و شانازی دایک و باوکیشی بێت. کایۆ ڕۆژێک لەڕۆژان لەگەڵ دایکی بە شەقامێکدا تێدەپەڕین



**له بازاڕ، کایۆ دیمەنێکی سەیری بینی و زۆر سەرسام بوو، بۆیە لەدایکی پرسی ئەو خانمە بۆ لەسەر ئەو پاسکیلە سەیرەیە و کەسێک پاڵی دەنێت؟ دایکی کایۆ وەڵامی دایەوە و وتی: ئەو خانمە لە نەخۆشخانە گەڕاوەتەوە، ئەو قاچەکانی بەهۆی ڕووداوی هاتوچۆوە لەدەست داوە، چیدی ناتوانێت بڕوات لەسەر قاچەکانی. کایۆ خەمبار بوو، بە نیگەرانییەوە لەدایکی پرسی: ئەی چۆن هەڵسوکەوت دەکات؟ دایکی کایۆ وەڵامی دایەوە و وتی: ئەو خانمە ئێستا پێی دەوترێت (خاوەن پێداویستی تایبەت) ئەو خانمە کەسوکارەکەی هاوکاری دەکات، منداڵەکانی و هاوڕێکانی هەموویان هاوکاری دەکەن، پێویستە لە هەر شوێنێک ئەم جۆرە کەسانەت بینی ئەگەر پیاو بوون یان خانمان، پێویستە لێیان بپرسی ئایا پێویستیتان بە هاوکاری نییە؟ ئەگەر پێویستیان بەهەر کارێک بوو، پێویستە هاوکاریان بکەیت.**



# کایۆ چۆن سەرکەوتوو بوو؟

کایۆ کە گەورە بوو کاتی خوێندنگای هات، چووە خوێندنگاو بەباشی گرنگی بە وانەکانی دەدا و لەگەڵ هاورێکانی زۆر بە شادی و خۆشیەوە دەچوو بۆ خوێندنگا، ئەو هەمیشە جل و بەرگەکانی جوان بوون، بە پاک و خاوێنی ڕایدەگرتن، لە وانەکانیدا دوانەدەکەوت و بەباشی ئامۆژگاری مامۆستاکانی لە گوێ دەگرت، کایۆ کاتە بەتاڵەکانی بەسەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە نەدەکوشت و هەمیشە لە کاتە پشووەکانیدا و ڕۆژەکانی هەینیدا هاورێیەتی گیانلەبەرەکانی دەکرد و سواری پسکیل دەبوو، خولیای فێربوونی گۆرانی و مۆسیقای هەبوو، بەناو باخچەیماڵەکەیاندا دەگەڕاو ئاوی گوڵ و ڕووەکەکانی دەدا، لەگەڵ هاورێکانی ڕەفتاری جوان بوو، گرنگی بەساڵیادی لەدایک بوونیان دەدا و هەرگیز تانە و وشەی



ناشیرینی بەرامبەریان بەکار نەدەهێنا، کایۆ زۆر هاوڕێکانی خۆش دەویست، ڕێزی دایک و باوکیانی دەگرت و هەرگیز لەگەڵیان شەڕی نەدەکرد، کایۆ زۆر حەزی لە وەرزش بوو، بەتایبەتی یاری تۆپی پێ، لەگەڵ خوشکە بچوکەکەی هەمیشە یاری دەکرد و هەرگیز پشت گوێی نەدەخست، کایۆ یاری تێنسی دەکرد، سەرەڕای ئەوەی چەندین یاری دەکرد، بەڵام هەرگیز خۆی پیس نەدەکرد، چونکە دایکی پێی وتبوو: نابێت وەک منداڵێکی پیس و پۆخڵ بناسرێت، کایۆ سەرەڕای هەموو یارییەکانی زۆرتر و زۆرتر گرنگی بە خوێندنەوەی کتێب دەدا، هەرگیز کاتی چوونی بۆ خوێندنگا فەرامۆش نەدەکرد، هەمیشە بەوە ناسراو بوو کە لەکاتی خۆیدا لە خوێندنگاکەی ئامادە دەبێت. کایۆ جگە لە کتێبەکانی خوێندن، کتێبی چیرۆکیشی دەخوێندەوە، کایۆ هەمیشە داوای لە باوک و دایکی دەکرد کە کتێبی بۆ بکڕن و بیخوێنێتەوە، کایۆ زۆر سودی لە کتێبەکان وەردەگرت، فێری چەندین شتی جوان و باش دەبوو لێیان، بۆیە کە گەورە بوو ڕیشیشی دەرکرد، هەر هاوڕێی کتێب و خوێندنەوە بوو.



# بەسەرهاتی ئۆسكار لە بیاباندا

ئۆسكار مارمێلكەیەكە كە لە بیابانێكی نا دیاریكراودا دەژێ، بیابان لە دەشتی بەرین و وشك و برن و لمای پێك هاتووە كە خواردن و خواردنەوەی لێنیەو ژیان زۆر تێدا ئەستەمە، ئۆسكاری مارمێلكە لە بیابانەكانی ئەمریكای باشور دەژی، لە ڕێگایەكی خێرای قیرتاوكراو هەیە كە بە ناوچەكەدا بەناو بیابنەكەدا تێپەڕدەبێت كە جاروبار بەكار دەهێنرێت لەلایەن ئوتۆمبێلی بارهەڵگری جیاوازەوە، ئۆسكاری مارمێلكە بەبەردەوامی بۆ مانەوەی لە ژیان بەدوای ئاو و خۆراكدا دەگەڕێت هەندێك جار شلەیەك لە بۆتڵێك یان لە هەرشوێنێكی بیابانەكە دەدۆزێتەوە كە لەلایەن مرۆڤەكانەوە فڕێدەرێت، بەڵام دواجار بێ ئومێد دەبێت لە خواردنەوەی، لەبەر ئەوەی هەندێك هاوڕێكانی وەك ئەو برسی بوون و خواردن و خواردنەوەیان دەست نەدەكەوت



کێشەیان بۆ دروست دەرکردوو نەیان دەهێشت ئۆسکاری مارمێلکە سود لە ئەو شتانە وەربگرێت، لە بیابانەکەدا تەنیا مێرگێک هەیە کە ناوی سازگاری تێدابێت بەڵام ژمارەی زۆری تیمساحە برسیەکان رێگرن، لەهەمان کاتیشدا مارمێلکە خواردنێکی بەلەزەتە بۆ مریشکەکان، ئۆسکاری مارمێلکە هەندێکجار هەوڵی دەدا هێلکەیەک لە کۆمەڵە مریشکەکان بدزێت یان هەندێک جار پاشماوەی فڕێدراو دەدۆزێتەوە، بەڵام لە هەموو ئەمانەدا سەرکەوتو نەدەبوو لەبەر ئەوەی بە بێ پلان ئەو کارەی دەکرد، گیانلەبەرەکانی دەورو بەری ئۆسکاری مارمێلکە کە ئەوانیش برسی بوون کارەکەیان لە ئۆسکار تێک دەدا.

(پۆپی)ی رێویەکی ئەفریقایی بچوک و (بەک)ی هەڵۆ و (هارکی)ی کەمتیار پێکەوە لە پاسێکی خوێندنگای فەرامۆشکراوی کرابدا دەژین کە لە تەنیشت گردێک دانراوە، دوای ئەوەی ئەو پاسە توشی ڕووداوی هاتوچۆ دەبێت لە بیابانەکەدا فڕێ دەدرێت، دەبێتە شوێنی نیشتەجێبونی پۆپی و هارکی، بەڵام بە زۆری بە گالیسکەی دەستی پێشبڕکێ دەکەن کە هارکی پاڵدەنێ و پۆپی ئاراستەی دەکات ئەمانیش وەکو ئۆسکاری مارمێلکە بەدوای خۆراک و ئاودا دەگەڕێن هەمیشە ئەم دوانە ململانێ لەگەڵ



ئۆسکاردا دەکەن.
ئۆسکاری مارمێلکە هەمیشە لە کێشەدایە لەگەڵ (پۆپی و هارکی و بەک) و هەروەها مریشکەکانیش، ئۆسکار هەمیشە هەوڵ دەدات مێشولە بگرێت و تۆزیک ئاوی دەست بکەوێت بەڵام زۆربەی جار شتەکان بەو شێوەیە نابێت کە هەوڵی بۆ دەدات، هەرجارێکیش شتێکی دەست بکەوێت (پۆپی و هارکی و بەک) لێی دەبەن، لە هەمانکاتیشدا ئۆسکاریش هەندێکجار هەوڵ دەدات خواردنی ئەوان ببات.
پۆپی: ڕێوییەکی ئەفریقایی بچوکە سەرکردەی ئەو دووانەی ترە، تەنیا ئەو فەرمان دەکات چاوچنۆک و چڵێسە و ئۆسکاری مارمێلکە بەتەواوەتی گیری خواردووە بە دەستییەوە.
بەک: هەڵۆیە و لە دوانەکەی تر زیرەکترە، هەمیشە ڕازی دەبێت کاتێک کە پۆپی بەسەر هارکی دا هاوار دەکات.
هارکی: کەمتیارە لە هەردوکیان بەهێزترە، ئەرکە جەستەییەکان جێ بەجێ دەکات، بە شێوەیەکی ئاسایی وەکو هێزی لێخوڕ ڕۆڵ دەبینێ کە پاڵی گالیسکەکە بۆ بەدوای کەوتنی ئۆسکاری مارمێلکە یان مریشکەکان زۆرجاریش بەشێویەکی گێل نیشان دەدرێت.



مانۆلۆ: شوفێری بارهەڵگرەکەیە کە کەلوپەلی جیاواز لە بیابانەکەدا دەگوازێتەوە، هەمیشە نوستوە و سەگەکەی کە ناوی ڕۆکۆیە ئوتۆمبێلەکە لێدەخوڕێ.
ڕاکۆ: سەگە بەوەفا و دڵسۆزەکەی مانۆلۆ کە هەمیشە هەوڵی سەلامەتی بارهەڵگرەکە دەدات و بە بەردەوامی دوای ئۆسکار یان (پۆپی و هارکی و بەک) دەکەوێت.
مریشکەکان: نزیکی چاوەکانیان سیمایەکی توڕەیی پێبەخشیون، هەر شتێک بکەوێتە تەڵەیانەوە کوێرانە پەلاماری دەدەن.
تیمساحەکان: ترسناکترین و دڕندەترین ئاژەڵی بیابان.
بودەڵەکە: زۆر بەباشی بۆن ناکات، هەمیشە لە ئۆسکار دەترسێت بەڵام (پۆپی و هارکی و بەک) هەمیشە لێی دەترسن ئەویش لەبەر بۆنەکەی، زۆرجار میوەکانیان دەبات.
قالۆنچە ڕەقە: هاوڕێی ئۆسکار کە جاروبار یارمەتی دەدات لە بارودۆخە قورسەکان.
میرکات (ئاژەڵێکی ئەمریکیە): دزەکانی بیابان هەندێکجار کەلوپەل لە (پۆپی و هارکی و بەک) دەبەن.
ئۆسکاری مارمێلکە مارمێلکە لەم بیابانە وشک و برنەدا هەمیشە توشی کێشە دەبێت،



بۆیه بڕیار دەدات کە ئیتر بە ژیرانە بەدوای سەرچاوەی ژیانی خۆراک بگەڕێت و بە لەسەر خۆی کارەکانی بکات، ئۆسکاری مارمێلکە لەم بڕیارەی سود وەردەگرێت و لە بیابانە سەختەدا بە ژیرانە خواردن پەیدا دەکات و بە ژیرانە دەیخوات، لە شوێنە سەختەکاندا دەبێت ڕێزی هەموو ئەوشتانە بگرین کە بە نارەحەت دەسمان دەون، لەبەر ئەوەی کە دواتر دەستکەتنەوەیان زەحمەت دەبێت و ژیانمان دەکەوێتە مەترسییەوە، وە دەبێت لە و هاوڕێ و کەسانە دوربکەوینەوە کە کێشەمان بۆ دروست دەکەن و چەپەڵ و چاوچنۆکن، دەبێت ڕێزی ئاوبگرین چونکە بەئاسانی دەستمان ناکەوێت، سەرچاوەی سەرەکی ژیانمانە، ئۆسکاری مارمێلکە هێمنی ژیرانەییە هەڵبژارد بۆ ئەوەی بەسەر ئەو کەسانەدا سەربکەوێت کە کێشەی بۆ دروست دەکەن، وە سەرکەوتوش بوو، ئۆسکار لەبەر بیرکردنەوەکانی سەرەڕای بچوکییەکەی بەسەر هەموو گەورەکاندا سەردەکەوێت، چونکە بیرکردنەوە بە گەورەو بچوکی نییە، هەمیشە بیرکردنەوە هۆکاری سەرکەوتنەکانمانە، بۆیە ئێوەش دەتوانن ڕێگای زیرەکی و لەسەر خۆیی هەڵبژێرن لە ژیانتانا بۆ ئەوەی سەرکەوتوبن.



# ئەلیسی جوان، لە مەملەکەتێکی سەیروسەمەرەدا

ڕۆژێکی خۆرەتاو ئەلیس و خوشکەکەی لەژێر دارێک دانیشت بوون. ئەلیس هەستی بەبێزاری کرد کاتێک کە کەروێشکێکی سپی بینی کە دەچوو ناو کونەکەیەوە. ئەلیس بەدوای کەروێشکەکەدا ڕۆیشت تاوەکو گەیشتە بنی بنەوەی کونەدرێژەکەی کە کەروێشکەکە چووە ناوییەوە. ئەلیس لە کونەکەدا بە ژوورێک دەگات. ئەلیس چاوی دەکەوێت بە مێزێک، مێزەکە کلیلێکی بچووکی لەسەر بوو، کە هی دەرگایەکی بچووکی قوفلکراو بوو. ئەلیس دەرگایەکەی کردەوە و باخچەیەکی جوانی بینی، بەڵام ئەلیس نەیدەتوانی بچێتە ناوییەوە، چونکی ئەو زۆر گەورە بوو. لە ژوورەکەدا



ئەلیس بوتلێکی لەسەر مێزەکە بینی کە لەسەری نووسرا بوو «بمخۆرەوە.» ئەلیس خواردییەوە، پێی وابوو کە ئەوە یارمەتی دەدات تاوەکو قەبارەکەی بچووک بێتەوە بتوانێت بەناو دەرگایەکەدا بڕوات. دوای خواردنەوەکە ئەلیس قەبارەی بچووک ببۆوە، بەڵام دوای ئەوە ئەلیس پارچە کێکێکی بینی و بەنیشانەیەک لەسەری نووسرابوو «بمخۆ.» ئەلیس سێ و دوو لێ نەکرد و یەکسەری پارچە کێکەکەی خوارد، پارچە کێکەکە ئەلیسی زۆر درێژ کرد، ئەلیس دەستی کرد بە گریان و حەوزێکی دروست کرد لە فرمێسکەکانی. کەروێشکە سپییەکە هاتەژوورەوە و ئەلیسی بینی کە چۆن فرمێسک لە چاوانی دێنە خوارەوە و بەسەر کڵاوە سپییەکەی خزمەتکارەکەدا دەبارێت. ئەلیس کڵاوەکەی بەدەستەوە گرت و چووەوە ناویەک. ئەلیس مشکێکی لەوێ بینی، دوای ئەوە ئەلیس چاوی کەوت بە چەندین باڵندە و گیانەوەر. باڵندە و گیانەوەرەکان تەڕبوون و سەرمایان بوو، بۆیە دۆدۆ (باڵندەیەکە لە قەلەموون دەچێت) پێشنیازی



ڕاکردنی کرد لە یارییەکە. نیو سەعات دواتر یارییەکە تەواو بوو و، هەمووان براوە بوون. ئەلیس چوکلێتێکی بردەوە وەکو خەڵات. ئەلیس پشیلەکەی (کەناوی دینا) بوو ون کرد. کاتێک ئەلیس دەربارەی ون بوونی پشیلەکەی قسەی دەکرد، گیانەوەر و باڵندەکان دووردەکەوتنەوە. لەوکاتیدا کەروێشکە سپیەکە دەردەکەوێتەوە و وادادەنێت کە ئەلیس ماری ئانە (ماری ئان کارەکەری خانووەکەیە). بۆیە داوا لە ئەلیس دەکات بڕوات کڵاوە سپیەکە بێنێت. ئەلیس دەڕواتە ناو خانووەکە و بوتڵێک دەدۆزێتەوە. ئەلیس لە بوتڵەکە دەخواتەوە و بە چەشنێک گەورە دەبێت کە ناتوانێت بێتە دەرەوە لە خانووەکە. لەوکاتیدا کێکێکی فڕێدراو لەلای پەنجەری ژوورەکە خانووەکە دەبێت و ئەلیس دەیخوات و بەهۆییەوە ئەلیس دووبارە بچووک دەبێتەوە و دواتر دێتە دەرەوە لە خانووەکە. ئەلیس ڕادەکاتە ناو باخچەکە و هەندێ گەڵای دار دەبینێت کە کرمێکی پەروانەیەکی بەرگ شینی لەسەر گەڵاکان دەبێت.

کرمەکە پەروانەیەکە زۆر دۆستانە نییە و پرسیاری زەحمەت لە ئەلیس دەکات تاوەکو ئەلیس تووڕە ببێت. ئەلیس دەیەوێت گەورەتر بێت، بۆیە کرمە پەروانەییەکە دوو



جۆر قارچک پیشانی ئەلیس دەدات، کە یەکێکیان گەورەتری دەکات، ئەوەی تریشیان بچووکتر. ئەلیس لە هەردووکیان دەخوات تاکو بگات بە بەرزیەکی مامناوەند. ئەلیس دووبارە بەناو باخچەکەدا پیاسە دەکات و قارچکێکی قاوەی دەخوات و دووبارە قەبارەکەی زۆر بچووک دەبێتەوە و دەڕواتە ناو خانووەکە. لەناو خانووەکەدا ئەلیس چاوی بە ژنێکی ناشرین دەکەوێت، ژنە ناشرینەکە خێزانی پاشایە و منداڵێکیشی لەگەڵ دەبێت. لە نزیک ئاگردانی ناو خانووەکە چێشلێنەرێک و پیشیلەیەکی لێیە. ئەلیس زۆر نیگەران دەبێت چونکی چێشلێنەرەکە خواردن و کەوچک و کووپەکان فڕێدەدات. ژنەکە منداڵەکە هەڵدەداتە ئاسمان و دێتەوە، دواتر منداڵەکە فڕێ دەداتە لای ئەلیس. ئەلیس سەری سوردەمێنێت ئەوکاتەی منداڵەی دێتە لای یەکسەری منداڵەکە دەبێتە بەراز، ئەلیس یەکسەری دەردەپەڕێت بۆ ناو باخچەکە. پشیلەی لای ئاگردانەکە باسی دیارنەمانی ماد هاتەر (پیاوێکی سەرنجراکێشە) و مارچ هێیەر (کە ئەویش کەروێشکێکە) بۆ ئەلیس دەکات. ئەلیس بڕیاردەدات بڕوات بۆ ماڵی



کەروێشکەکە و کاتێک دەگات، ئەلیس دەبینێت کە گەورەتر بووە، بۆیە هەندێ قارچک دەخوات تاوەکو دووبارە بچووک ببێتەوە. ئەلیس پەیوەندی دەکات بە ئاهەنگی چاخواردنەوەی ماد هاتەر و مارچ هێیەر و مشکەکە. ئەلیس بۆی دەردەکەوێت کە ئەوان چەندە بێ ئەدەبانە رەفتار دەکەن، بەتایبەت ئەوکاتەی کە چەندین نوکتە لەسەر ئەلیس دەڵێن و بێرێزی بەرانبەری دەکەن، بەمەش ئەلیس تورە دەبێت و ئەوێش بەجێ دێلێت. ئەلیس دەگات بە دەرگایەک کە لەو دەرگا رەت دەبێت دەگاتەوە بە دەرگایەکی تر کە بەرەو باخچەکە دەیبات. لەوکاتی خۆی گرژدەکاتەوە تاوەکو بتوانێت بەناو دەرگایەکەدا بڕوات. لەناو باخچەکەدا ئەلیس بەسەر سێ کارت دا دەڕوات کە بە گوڵی سوریان لەسەر بوو. ئەوکاتەی کە شا و شاژن دەگەن، شاژن فەرمان بە پیاوەکانی دەکات کە سەری باخچەوانەکە ببڕن. بەهۆی ئەوەی کە هیچ کەس سەری نابڕدرێت، بۆیە شاژن سزا بەسەر پیاوەکانی و خەڵکی تردا دەسەپێنێت. ئەلیس چاوی دەکەوێت بە پشیلەکەی و ئەوکاتەی پاشا ئەوە دەبینێت داوا لە شاژن



دەکات کە فەرمان بە پیاوەکانی بکات تاوەکو سەری پشیلەکە هنجن بە هنجنی بکەن. پشیلەکە ون دەبێت و ناتوانن ئەویش هنجن بە هنجنی بکەن. هەمووان دەڕۆن بۆ ناو خانووەکە بۆ دادگایکردن. نۆکەری دڵەکان تۆمەتبار دەکرێت بە دزینی هەندێ کێک و کەروێشکە سپییەکە بانگی شایەتحاڵەکان دەکات و یەکەم شایەتحاڵ ماد هاتەرە و دووەمیان چێشتلێنەرەکە، بەڵام هیچ کامیان ناتوانن یارمەتی کەیسەکە بدەن. دواتر ئەلیس دێت، کە هەموو کاتەکان هەر درێژ و درێژ دەبێت. پاشا داوای لێ دەکات کە ژوورەکە بەجێ بێڵێت، بەڵام ئەلیس لێیان ناترسێت چونکی ئەوان تەنیا کارتن. لەناکاو خوشکەکەی ئەلیس بەخەبەر دێنێت، کە ئەلیس بەدرێژای کاتەکە لەخەودا بووە، ئەوانەش هەمووی خەون بوون. ئیدی ئەلیس و خوشکەکەی لەژێر دارەکە دەڕۆنەوە بۆماڵەوە بۆ چا خواردنەوە.



# چیرۆکی برەیڤ (بوێری)

سەردەمانێک پێش ئێستا، شانشینێک هەبوو ناوی دۆن برۆک بوو کە خاکێکی زیانگەیەنەر و خۆبەزلزان بوو، ئەو شانشینە لەلایەن پاشا فێرگس و ئیلانۆر فەرمانڕەوایەتی دەکرا، پاشا فێرکس کەسێکی ئازا و بەهێز بوو شاژنە ئیلانۆر یش خاتونێکی ژیر و دادپەروەر بوو، پاشا فێرگس قاچێکی لەدەست دابوو کاتێک لەگەڵ ورچێکی شەرانگێزدا شەری کردبوو کەناوی مۆردو بوو، وەکو تۆڵەسەندنەوەیەک پاشا سوێندی خواردبوو کە هەر ئەبێت رۆژێک ئەو ورچە شەرانگێزە لەناوبەرێت، پاشا و شاژن سێ کوڕ و کچێکیان هەبوو، کچەکەیان ناوی مێریدا بوو دایکی دەیویست کچەکەی ئامادە بکات تا ببێت بە شازادە و بەکچەکەی دەوت «شازادە دەبێت زانیاری هەبێت سەبارەت بە شانشینەکەی وسەرباری هەموو ئەوانەش دەبێت شازادە هەوڵی تەواو بدات بۆ ئەوەی کەسێکی نمونەیی بێت»، بەڵام مێریدا



یاساکەی دایکی زۆر بەدڵ نەبوو بۆیە بە سواری ئەسپەکەی کە ناوی ئانگێس بوو بەوپەڕی خێراییەوە بە لادێکەدا لێیدەخوڕی و تیری دەهاوێشت، مێریدا زۆر کارامە و شارەزا بوو لە تیر هاوێشتندا. ئێوارەیەکیان شاژن هەواڵێکی پڕ جۆشی لە هۆزەکانی (ماکنتۆش و ماک گافن و دینگ وۆڵ) پێگەیشت، بە مێریدای ووت نۆبەرەکانی هەر هۆزێک پێشبڕکێ دەکەن لە گۆڕەپانی یاریەکان، شازادەش شوو بە براوەی یاریەکە دەکات، مێریدا بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر ترساو هاواری کرد، شوو کردن؟! من رازی نابم، ئەمەی ووت و لە ژوورەکە بە پەلە چوە دەرەوە، دایکی بەدوایدا ڕۆشت و چیرۆکی شانشینێکی زۆر کۆنی بۆ گێڕایەوە کە تێیدا پاشاکە خاکەکەی بەسەر چوار کوڕەکەیدا بەش کرد بەڵام یەکێک لە کوڕەکانی دەیویست فەرمانڕەوای شانشینەکەکە بکات بەو ڕێگایەدا ڕۆشت و خۆی جیاکردەوە بۆیە تەختی شانشینەکە رووخا، شاژنە ئیلانۆر سەیرێکی کچەکەی کرد و پێی ووت: پێشینەکان ڕێنیشاندەری ئێمەن ئەوان بازنەیی راستین. سەرباری نارازیبوونی مێریدا هۆزەکان گەیشتن ڕێگە بە مێریدا درا تاکو یەکێک لە رووبەرووبونەکان هەڵبژێرێت، لەناکاو مێریدا بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات و ووتی: من تیر هاوێشتن هەڵدەبژێرم، دوای ئەوەی گەنجەکانی ئەو سێ هۆزە نۆرەکانی خۆیان تەواو کرد لە تیر هاوێشتندا، مێریدا هاتە



گۆڕەپانەکە و ووتی من نۆبەرەی هۆزی دون برۆک م بە دەستی خۆم تیرەکان دەهاوێژم، مێریدا لەسەر یەک تیرەکانی لە چەقی بازنەکە دەدا، شازادە ئێلانور تورە بوو و مێریدا ی برد بۆ قەڵاکە، مێریدا بە رووی دایکیدا وەستاو و پێی ووت: ئەوە هەموو ئەو شوو کردنە بوو کە باست دەکرد؟ ئایا تۆ هەرگیز پرسیارت لە خۆت کردوە کە من چیم ئەوێ؟ من نامەوێت وەکو تۆ بم، رووی کرد ئەو وێنە چنراوە خێزانیەی کەبە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو و بە شمشێرەکەی دڕاندی و بە خێرایی لە قەڵاکە رای کرد و سواری ئەسپەکەی بوو. مێریدا و ئەسپەکەی بە دارستانەکەدا بە خێرایی دەڕۆشتن بەڵام ئەسپەکەی لە ناکاو کتوپڕ وەستا، خۆیان لە ناوەڕاستی بازنەیی بەردا بینیەوە کە رووناکی شینیان لێدەدرەوشایەوە، مێریدا بەدوایدا ڕۆشت تا گەیشتە خانویەکی بچوک دەرگاکەی کردەوە و ژنێکی بەتەمەنی بینی، دوای ئەوەی تەماشای کرد مێریدا بۆی دەرکەوت کە ئەو ژنە جادوگەرە بۆیە لێی پاڕایەوە تا شتێکی بۆ بکات، ژنە جادوگەرەکە بە مێریدای ووت کە سەردەمێک پێش ئێستا شازادەیەکی بینیوە داوای لێکردوە کە هێزی دە پیاوی پێبدات، ئەمە ئەو شتە بوو کە مێریدا دەیویست بیبیستێ و بە جادووگەرەکەی ووت: ئەوە ئەوەیە کە من دەمەوێت داوی ئەوەت لێدەکەم کە دایکم بگۆڕیت، ئەگەر دایکم بگۆڕیت چارەنوسیشم دەگۆڕێت، جادوگەرەکە دەستی کرد بە فرێدانی شت بۆ ناو مەنجەڵێک شتەکەکان گلۆپیان



دەكرد و دەتەقین دواتر كێكێكی ناسک و بەلەزەتی دەرهێنا. مێریدا گەڕایەوە و كێكەكەی دا بە دایكی تا بیخوات، شاژن پێكەنی و دڵخۆش بوو كە كچەكەی گەڕاوەتەوە بۆ ماڵ و كێكەكەی خوارد بەڵام هیچ شتێک روونەدا!، دواتر دوای ئەوەی هەردووكیان بە مەمەڕی هۆڵەكەدا هاتنە خوارەوە دایكی لەناكاو ووتی: من زۆر باش نیم، مێریدا دایكی بردە سەر جێی نوستنەكەی و لە تەنیشتیەوە دانیشت دوای چەند خولەكێک دایكی هەستا، هەركە هەستا لە جێگاكەی لەبەرامبەر مێریدا وەستا، مێریدا هاواری كرد ( و-و - و- و وورچ)، مێریدا بڕوای بە چاوەكانی نەدەكرد كە دایكی بووە بە وورچ!، بۆیە مێریدا زانی كە پێویستە وورچەكە لە قەڵاكە بباتە دەرەوە لە ترسی ئەوەی ئەگەر باوكی بزانێ وورچێک لە قەڵاكەدایە ئەیكوژێت. لەو كاتەدا هەرسێ براكەی مێریدا كێكەكەیان بینی و لێیان خوارد وای ماوەیەكی كەم ئەوانیش هەستیان بە باشی نەدەكرد، مێریدا و دایكی رۆشتن بۆ ناو دارەكان، مێریدا دەیویست لەو داوایە پاشگەزبێتەوە كە لە جادووگەرەكەی كردووە سەبارەت بە گۆڕینی دایكی، بەڵام شەو هات و تاریكیان بەسەردا هات، بۆ بەیانی رۆژی



دواتر میریدا دایکی فێرکرد کە چۆن ڕاوی ماسی بکات لە رووبارەکە، بۆ یەکەمجار کچ و دایک کاتێکی خۆشیان پێکەوە بردەسەر، لە کۆتایدا توانیان ئەو خانوەی کە جادوگەرەکەی تێدا دەژیا بدۆزنەوە بەڵام کەسی لێنەبوو میریدا بازی داو دەنگێک لە ناو مەنجەڵی جادووگەرەکەوە هات و ووتی: چارەنوس دەبێ بگۆڕێت سەیری ناوەوە بکە و بە شانازییەوە ئەو پەیوەندیە شکاوە چاک بکەوە، دواتر هەمان رووناکیە شینەکان دەرکەوتنەوە میریدا و دایکی برد بۆ ناو قوڵایی دارستانەکە لەوێ میریدا بە شپرزەییەوە سەیرێکی دەورووبەری کرد و لەناکاو زەویەکە لە ژێر قاچیەوە شەقی برد و میریدا کەوتە ناو ژورێکی زۆر کۆنەوە کە پارچە بەردێکی لێبوو کە وێنەی چوار شازادەی لەسەر بوو بەڵام یەکێکیان شکا بوو، بیری کردەوە ئەوە هەمان ئەو چیرۆکەیە کە دایکی بۆی گێرایەوە سەبارەت بەشانشینەکە دواتر سەیرێکی دەوروبەری کرد و بینی کە ئێسک لەسەر زەویەکە کەوتوە و شوێنی چنگ بەسەر دیوارەکەوەیە لەناکاو میریدا ئاوڕی دایەوە و بینیی کە شازادەکە بووە بە وورچە شەرانگێزەکە مۆردو،میریدا بەزەحمەت توانی لەدەستی ئۆردو ڕابکات، خۆی و دایکی زۆر



بەخێرایی وەکو با لە پەنجەرەکەوە رایانکرد. مێریدا زانینی ئەگەر لە نزیکترین کاتدا لە داواکەی پاشگەز نەبێتەوە ئەوا دایکی بۆ هەمیشە بە وورچی ئەمێنێتەوە وەکو شازادەکە قسەی جادووگەرەکەی وەبیرهاتەوە کە ووتی: بە شانازییەوە ئەو پەیوەندیە شکاوە چاک بکەوە، مێریدا بە پەلە پێویست بوو بگەڕێتەوە بۆ قەڵاکە چونکە دەیزانی کە پێویست بوو کە چی بکات مەبەستی چنینی سەر دیواری قەڵاکە بوو کە شمشێرەکەی دڕاندی. لە قەڵاکەدا مێریدا بینی کە هۆزەکان لە شەڕێکی گەورەدان، پاشا فێرگس بە تووڕەییەوە دەیوت: هیچ کام لە کوڕەکان شایستەی ئەوەی نیە تا کچەکەم شووی پێبکات، پاشای هۆزی دینگ وۆل یش ئەمەی بە دڵ نەبوو ووتی: کەواتە هاوپەیمانیمان کۆتایی هات ئەوەش بەمانای شەڕ دێت، مێریدا کە بینی شەڕێکی قورسە بۆیە بیری لەوە کردەوە کە پێویستە شەڕەکە بوەستێنێ بۆیە بڕیاری دا کە شوو بە کێ بکات بۆیە roوویکردە قەرەبالغیەکە و ووتی: هۆزەکانمان پێشتر دوشمنی یەکتر بووین بەڵام کاتێک داگیرکەرەکان لە دەریاوە هەڕەشەیان لێکردین ئێوە بوون بە هاوپەیمان و یەکتان گرت بۆ بەرگریکردن لە خاکەکەمان ئەوە پەیوەندیەکی ئازایانە و دۆستانە بوو تا ئێستا وە من دەزانم کە ئێستا دەبێ هەڵەکەم ڕاست بکەمەوە ئەو پەیوەندیە چاک بکەمەوە. مێریدا سەیرێکی دایکی کرد کە



خۆی شاردبووەوە، دایکی ئاماژەی بۆی کرد کە خۆی ناتوانێت ئەو کەسە هەڵبژێرێت، مێریدا یەکسەر لە ئاماژەکەی دایکی گەیشت و ووتی: پێویستە بڕیاری دروست بدەم و نەریتەکان بشکێنم شاژنی دایکم لە دڵیەوە هەست بەوە دەکات کە ئێمە ئازاد بین لە نوسینی چیرۆکی خۆمان دوای قسەی دڵمان بکەوین و خۆشەویستی لە کاتی خۆماندا بدۆزینەوە»، لەو کاتەی خەڵکەکان هەموو چەپڵەیان بۆ لێدا مێریدا بە خێرایی بەرەو ئەو ژووره چوو کە چنینی سەردیوارەکەی لێبوو بینی کە دایکی لە مەترسیدایە و باوکی دەیەوێت بیکوژێت چونکە نەیدەزانی کە خێزانەکەیەتی وایزانی وورچە و هاتۆتە قەڵاکەوە مێریدا هاواری کرد (دایکە ڕاکە) دایکی ڕایکرد و پاشا فێرگس بە خێرایی دوای کەوت. مێریدا دەرزیەک و هەندێک دەزووی گرت بە دەستیەوە تا چنینی سەر دیوارەکە بدورێتەوە دڵنیا بوو لەوەی کە دەتوانێ ئەو سحرە بەتاڵ بکاتەوە، براکانی دۆزیەوە کە ببون بە بێچوە وورچ  بە خێرایی بەرەو دارستانی ئۆگەس رۆیشت و زۆر بە خێرایی چنینی سەر دیوارەکەی دوریيەوە، لەوێ پاشا فێرگس و راوچیەکان ئلانۆر ی شاژنیان گرت پاشای ماک گوفن کە ڕابەری دەستەکەی دەکرد ووتی: ئێستا تۆمان گرت!، شاژن لە ترسا دەینەڕاند



لەو کاتەی کە پاشا شمشێرەکەی بە ڕوویدا بەرزکردەوە تا بیکوژێت، مێرێدا کتوپڕ لە ناو دارەکانەوە بە شمشێرەکەیەوە دەرکەوت و بە باوکی ووت: ڕێگەت نادەم دایکم بکوژیت!، هەر لە ساتەدا دێوێکی زەبەلاح هاتە شوێنەکە و مێرێدا بە ترسەوە ووتی «مۆردو». مۆردو ی شەرانگێز لە هەموو راوچیەکانی دا و پاشا فێرگس ی فرێدایە ناو بەردەکان و رووی کردە مێرێدا، شاژنە ئیلانۆر نەڕاندی و پەلاماری ئۆردو ی دا، هەردوو وورچەکە پەلاماری یەکیاندا بەڵام شاژن ئۆردو ی فرێدایە ناو بەردەکان و هەموو بەردەکان کەوتن بەسەریدا و لەناوی برد، مێرێدا رایکرد بۆ لای دایکی و چنینی سەر دیوارەکەی دابەسەریدا بەڵام هیچ ڕووینەدا و بە دایکی ووت: ئاه دایکە ئەوە هەمووی هەڵەی من بوو من ئەمەوێت تۆ بگەڕێنمەوە، ئێلانۆر باوەشێکی پێدا کرد و ووتی: من لێرم وە هەمیشە لێرە لەگەڵت ئەبم، لەو کاتەی مێرێدا و دایکی باوەشیان کردبوو بەیەکدا لەناکاو دەستی مرۆڤێک بەر قژی مێرێدا کەوت، دایکی جارێکی تر بوەوە بە مرۆڤ و چیتر بە وورچی نەمایەوە (دایکە تۆ باشی) مێرێدا بە خۆشحاڵیەکی زۆرەوە بە دایکی ووت: زۆر باشم، دایکی پێکەنی و وەڵامی مێرێدای دایەوە، هەرسی کوڕەکەی بوونەوە بە مرۆڤ و هەموو شتێک ئاسایی بووەوە لە شانشینی دۆن برۆک و خێزانی پاشا پێکەنین و هەموویان باوەشیان کردەوە بەیەکدا.



# چیرۆکی پیتەرپان و تینکە بێڵ

لە خانەی چاودێری منداڵانەکانی ماڵی دارلین سەگێک چاودێری منداڵەکانی دەکرد، ڕەنگە بوونی ئەو سەگە هۆکاری زۆربەی خۆشیەکانی ئەو خانەیە بوو بێت، نانای برین پێچ سێ منداڵەکەی دەشت و پێداویستیەکانی دەدانێ و بە هەموو شێوەیەک چاودێری دەکردن و ئاگای لێیان بوو، شەوێکیان نانا لە خانەکە نە بوو ئەو شەوە شەوی پشووی نانا بوو، خاتوو دارلین چاودێری منداڵەکانی گرتبوە ئەستۆی و لە جیاتی نانا ئاگای لە منداڵەکان بوو، لەسەر کورسیەک دانیشتبوو خەوی دەهات و وەنەوزی دەدا. لەناکاو تارماییەک لە بەردەم پەنجەرەکە دەرکەوت و خاتوو دارلینی بە ئاگا هێنایەوە کاتێک تەماشای دەوروبەری کرد کوڕێکی سەیری بینی لە



ژوورەکەیا بۆیە زۆر ترسا و قیژاندی هەر لەو کاتەدا نانا گەڕایەوە بۆ خانەکە و ویستی پەلاماری کورەکە بدات بەڵام کورەکە لە پەنجەرەکەوە بازیدا و تەنها تارماییەکەی لە دوای خۆی بە جێهێشت! خاتوو دارلین تارماییی کورەکەی خستە ناو یەکێک لە چەکمەچەکان و وای دانا کە کورەکە دێتەوە بۆ بردنەوەی تارماییەکەی ئەو کات دەتوانن بە ئاسانی کورەکە بگرن. کاتێک بەڕێز دارلین لە ڕووداوەکەی دوێنی شەو ئاگادارکرایەوە زۆر گرینگی بە بابەتەکە نەدا ئەو ئێستا ئەوەندەی سەرقاڵی دۆزینەوەی کەسانی جیاوازە بۆ خانەکە ئەوەندە کاتی نیە بە دوای ئەو ڕووداوە بچوکانەدا بڕوات و پێوەی سەرقاڵ بێت چونکە پێی وا بوو نانا و سەگەکە بەرپرسیاریەتیەکی زۆریان لە ئەستۆیە، خاتوو دارلین و بەڕێز دارلین بۆ شەوی دواتر ماڵەکەیان بەسەر یەکێک لە خزمەتکارەکەدا بە جێهێشت و لە ماڵە چوونە دەرێ تاکو چاودێری نوێ بۆ خانەکە بدۆزنەوە، بەڵام دوای ئەوەی منداڵەکان



نوستن و گلۆپەکان کوژانەوە کوڕە سەیرەکە گەڕایەوە، ئەو کوڕە ناوی (پیتەر پان) بوو پەریەکی ئەفسانەیی لەگەڵ بوو کەوەک تۆپەڵێک رووناکی دەردەکەت ناوی (تینکە بێڵ) بوو. پیتەر سێبەرەکەی خۆی دۆزیەوە دوای ئەوەی هەموو چەکمەچەکانی خانەکە گەڕا بەڵام لە پەلە پەل و خۆشی دۆزینەوەی سێبەرەکەیدا تینکە بێڵی لە ناو یەکێک لە چەکمەچەکاندا بە جێهێشت و لەسەری داخست، لەو کاتەی کە پیتەر خەریکی لکاندنەوەی سێبەرەکە بوو بە خۆیەوە دەنگە دەنگی دروست کرد تا وای کرد (وێندی) کچی ماڵەکە بە ئاگا بهێنێتەوە، پیتەر بە وێندی ووت کە ئەو ڕایکردووە لەو رۆژەی کە لە دایک بووە چونکە گوێی لە دایک و باوکی بووە کاتێک باسی ئەو هەموو شتانەیان کردووە کاتێک کە گەورە دەبێت و دەبێت بە پیاو هەر بۆیە ئەو رۆشتووە بۆ ئەوەی لەگەڵ پەریەکان بژێت بۆ ئەوەی هەرگیز گەورە نەبێت. لە ناگاو پیتەر تینکە بێلی وەبیر هاتەوە کە لێی وون بووە بۆیە بەدوایدا گەڕا تاکو لە ناو یەکێک لە کراسەکانی چاودێری خانەکەدا دۆزیەوە، تینکە بێل قەبارەی هێندەی



ناو لەپێک دەبوو ئەوەندە بچوک بوو کە وێندی بە زەحمەت دەیتوانی بیبینێت، ئەو پەریەکی زۆر بێ ڕێز بوو وێندی بە ناوی ناخۆشەوە بانگ دەکرد. پیتەر وێندی لە سێ منداڵەکەی تر پێ پەسەندتر بوو پێی ووت کە خۆی و تینکە بێڵ لە (نێڤەر لاند) (نێڤەر لاند شوێنێکی خەیاڵی بوو کە گەورە بوون تێیدا دەوەستا بەشێوەیەک منداڵەکان بۆ هەمیشە بە منداڵی دەمێننەوە) لەگەڵ منداڵە وونبوەکاندا دەژین، ئەو منداڵانەی کە لە گالیسکەکەدا کەوتنە خوارەوە و هەرگیز نەدۆزرانەوە، پیتەر ناچاربوو بێت بۆ ماڵی وێندی تا گوێ لە دایکی بگرێت کاتێک چیرۆک بۆ ئەوانی تر دەگێڕێتەوە، پیتەر لە وێندی و براکەی پاڕایەوە لە گەڵیدا بڕۆن بۆ نێڤەر لاند بەڵێنی ئەوەی پێدان کە فێری فڕینیان بکات، بیرۆکەی فڕین بیرۆکەیەکی زۆر چێژ بەخشە کە هەمیشە منداڵ حەزی پێدەکات، بۆیە دوای چەند جارێک مەشق کردن لەسەر فڕین هەموویان لە پەنجەرەکەوە بە فڕین لە پەنجەرەکەوە ماڵەکە چوونە



دەریّ. لە نێڤەر لاند هندەکان لەگەڵ سەرۆک و شازادەکانیان لە هەوڵی پارستن و چاودێریکردنی منداڵە وونبوەکان بوون لە دەست گروپێکی چەتەی دەریا کە لە لایەن کاپتن هووکەوە سەرپەرشتی دەکران، کە قۆڵێکی لە جیاتی دەست قولاپکی پێوە بوو کاپتن هووک زۆر ئارەزووی بوو کە پیتەر دەستگیر بکات پیتەر ئەو کەسە بوو کە دەستی کاپتنەکەی بڕی بوو دەرخواردی تیمساحەکانی دابوو، تیمساحەکان زۆر حەزیان لە تامی گۆشتی قۆڵی کاپتن هووک بوو لە هەموو شوێنێک بەدوایەوە بوون بە دوای هەلێکدا دەگەڕان تاکو ئەوەی کە ماوەتەوە بیخۆن، بەڵام بە نیگەرانیەوە تیمساحەکان کاتژمێرەکەی دەستی کاپتنەکەیان خواردبوو هەرکاتێک کە لە کاپتن هووک نزیک دەبوونەوە چرکە چرکی کاتژمێرەکە کاپتن هووک ی بە ئاگا دەهێنایەوە رزگاری دەبوو لە دەست تیمساحەکان. بەفڕین پیتەر و تیکە بێڵ و وێندی و براکەی گەیشتنە نێڤەر لاند، کاتێک بۆ یەکەمجار منداڵەکانی نێڤەر لاند وێنیدیان بینی



وایان زانی باڵندەیەکی گەورەیە یەکێکیان چەند تیرێکی تێگرت، تینکە بێل هەستی بە ئیرەیی دەکرد ئەو پلانی ئەوەی دانا بوو کە تیری بۆ بهاوێژن،دواتر بینیان کە وێندی بە هۆی تیرەکانەوە گێژببوو دواتر پیتەر کە بینی تینکە بێل پلانەکەی دارشت بوو بڕیاریدا کە بۆ ماوەیەک دووری بخەنەوە، پیتەر بە منداڵەکانی ووت کە کە وێندی بۆ هێناون بۆیە منداڵەکان دەستبەجێ خانویەکیان بۆ درووست کرد و داوایان لێکرد ببێت بە دایکیان وێندی بیری کردەوە کە بوون بە دایکی ئەو هەموو منداڵە بەرپرسیاریەتێکی زۆر گەورە دەکەوێتە سەر شانی بەڵام ڕازی بوو ببێت بە دایکیان ئەویش بە گێڕانەوەی چیرۆک و خەواندنیان. چەتەکانی دەریا پلانی دزینی وێند یان دارشت بۆ ئەوەی بیکەن بە دایکی خۆیان نیازیان وابوو کەزۆر لە منداڵەکان بکەن لە سەر پارچە تەختەیەکی درێژ بڕۆن، پیتەر گوێی لێبوو کە پلانەکەیان داڕشت بۆیە وێندی و منداڵەکانی پاراست بە پەڕینەوەیان لە دەریاکە لە ڕێی هێلانەی باڵندەوە، وێندی و براکانی نیگەرانی دایک و باوکیان بوون بۆیە بڕیاریاندا کە پێویستە بگەڕێنەوە ماڵەوە، منداڵە وونبوەکان دڵخۆش بوون بە هەبوونی دایکێکی تەواو گەشەکردوو بۆیە بە پەرۆشەوە داواکەی وێندیان قبوڵ کرد، بەڵام پیتەر ئەوەی



ڕەتکردەوە کە لەگەڵیان بڕوات چونکە ئەو دەیویست بۆ هەمیشە بە منداڵی بمێنێتەوە و خۆشی ببینێت ڕێگەی بەوان دا کە بڕۆن و بە تیکە بێڵی ووت کە ڕێگەیان نیشان بدات. چەتەکان بە گەشتی منداڵەکانیان زانی و هەریەکە لە تیکە بێل و منداڵەکان دەستیان کرد بە فڕین لە نێڤەر لاند ەوە بەرەو ماڵی دارلین، کاپتن هووک و پیاوەکانی هەموویانیان دەستگیر کرد کاتێک پیتەر بەمەی زانی سوێندە خوارد کە تۆڵە لە هووک بکاتەوە، لەسەر کەشتیەکە چەتەکان، منداڵەکان ئامادەکرابوون بۆ ئەوەی بەسەر تەختەکەدا ڕێ بکەن، هەموو ئاهەنگیان بەرامبەر بە وێندی دەگێرا کە بەسترابوو بە دارێکەوە، بەبێ ئاگاداری چەتەکان پیتەر لەسەر تەختەکە بوو بە بەکارهێنانی فێڵ و دەنگی ساختە وای کرد چەتەکان یەک بە دوای یەک بەرەو مەرگ بڕۆن ئەم ڕووداوە وای کرد کە چەتەکانی دەریا یەک بە دوای یەکدا خۆیان فڕیبدەنە خوارەوە بۆ ناو چەناگەی تیمساحە ئارمگرتووەکان. لە هەمانکاتدا ماڵی



دارلین و خاتوو دارلین و نانا بە هیوایەکی کەمەوە چاوەڕێی گەڕانەوەی منداڵەکان بوون پەنجەرەی خانەی چاودێریەکەیان بە کراوەیی بە جێهێشت بە ئومێدی ئەوەی منداڵە خۆشەویستەکان بگەڕێنەوە، بەڵام پیتەر و تیکە بێل پیش منداڵەکان بە فڕین گەیشتنە ماڵەکە و پەنجەرەکەیان داخست بۆ ئەوەی وای دەربخەن کە چاوەڕێی منداڵەکان ناکەن بەڵام پیتەرو تیکە بێڵ لە ژوورەوە گیریان خوارد نەیانتوانی لە دەرگاکەوە بێنە دەرەوە ناچار جارێکی تر پەنجەرەکەیان کردەوە، وێندی و منداڵەکان بە فڕین جارێکی تر خۆیان کرد بە ماڵەکەیا و چونە شوێنی نوستنەکەیان خاتوو دارلین و نانا زۆر دڵخۆش بوو بە بینینی منداڵەکان بە سەلامەتی. خاتوو دارلین منداڵە ونبوەکانی کرد بە منداڵی خۆیان و خۆشی و شادی باڵی کێشا بەسەر ماڵەکەدا و پیتەر چەند جارێک گەرایەوە بۆ ماڵەکە بۆ ئەوەی وا لە وێندی بکات لەگەڵیدا بگەڕێتەوە بۆ نێڤەرلاند بەڵام وێندی ئەوەی ڕەتکردەوە کە جارێکی تر دایک و باوکی بەجێ بهێڵێ، لەگەڵ منداڵ ونبوەکاندا پێکەوە زۆر دڵخۆش و ئاسودە بوون.

# بەسەرهاتی چوار مۆسیقارەکە



دەگێڕنەوە لەنزیک شارێک ئاشەوانێکی بێبەزەیی دەژیا، گوێدرێژێکی هەبوو ڕۆژانە زۆر ماندووی دەکرد، بەهۆی بارکردنی فەردە دانەوێڵەو گوێزانەوەی بۆ ئاشەکە، هەتا گوێدرێژەکە پەکی کەوت، بەیانیەکیان گوێدرێژەکە لەژێر بارە قورسەکەیدا کەوت، ئاشەوانەکە زۆر تورە بوو هاواری لێکرد: ئەی تەمبەڵ! کەڵکت نەماوە، لەبەرچاوم مەمێنە، لەمناوە نەتبینم، گوێدرێژەکە بڕیاریدا بەرەو شارێکی تر بڕوات بەو هیوایەی بتوانێت لەگەڵ تیپی مۆسیقای ئەو شارەدا فێری مۆسیقا ژەنین ببێت. بۆ یەکم جار، گوێدرێژەکە هەستی کرد کە ئازادە، زۆر شادمان بوو بەو ئازادییەی، کاتێک بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتن سەگێکی بینی لە لاڕێکەدا پاڵکەوتووە، خەم و پەژارەی پێوە دیاربوو گوێدرێژەکە لێی پرسی چی دەکات لەم چۆڵەوانیە؟ سەگەکە وەڵامی دایەوەو ووتی: پیربووم و ناتوانم وەک جاران بەخێرایی ڕابکەم خاوەنەکەم دەریکردم چونکە بەکەڵکی نایەم. گوێدرێژەکە پێشنیاری کرد و ووتی: ئەگەر دەتەوێت دەتوانیت لەگەڵ مندا بێیت بەرەو شارێک دەڕۆم و بەنیازم لەگەڵ تیپی مۆسیقای ئەو شارەدا مۆسیقا بژەنم، سەگەکە ڕازی بوو لەگەڵ هاوڕێ تازەکەیدا بڕوات. کەمێک ڕۆیشتن، پاشان



گوێیان لەدەنگی پشیلەیەک بوو دەیمیاواند کە لەلا ڕێکەدا دانیشتبوو لێیان پرسی: چی دەکەیت لێرە؟ پشیلەکە وەڵامی دانەوەو ووتی: هەڵهاتووم، تا لەتوڕەیی خانمەکەم ڕزگارم بێت، گەنجێتیم لەدەستدا وەک جاران ناتوانم مشک ڕاو بکەم! گوێدرێژەکە پێی ووت ئێمە دەچین بۆ شاری بریهمە بۆ بەشداریکردن لە تیپی مۆسیقای ئەو شارەدا، لەگەڵماندا وەرە! پشیلەکە هاواری کرد: ڕازیم! هەر سێکیان بەرەو شار بەڕێکەوتن، سێ هاوڕێکە پاش کەمێک گەیشتنە نزیک کێڵگەیەک، کەڵەشێرێکیان بینی لەسەر دیوارێک وەستاوە و دەقوقیچنێ، گوێدرێژەکە بەسەر سامیەوە پرسی: بۆ دەقوقێنیت.؟ دنیا نیوەڕۆیە. کەڵشێرەکە وەڵامی دایەوەو ووتی: هەوڵدەدەم دەنگم تاقی بکەمەوە، چونکە پیربووم و دەنگی جارانم نەماوە، تەنانەت هەندێکجار ناتوانم خاوەنەکەشم بە ئاگا بهێنم لەخەو، لەبەر ئەوە تورە دەبن، دەترسم کار بگاتە ئەوەی سەرم ببڕن و بمخەنە سەرخوانی ئێوارەیەکیان! گوێدریچژەکە پێی ووت: لەوانەیە بتوانیت هەموو خەڵکانی کێڵگەکە بە ئاگابهێنیت، چونکە دەنگت خۆشە، دەتوانیت لەگەڵ ئێمەدا بێیت تا بتوانیت لەگەڵ تیپی مۆسیقای شاری بریهمەدا گۆرانی بڵێت، کەڵەشێرەکە پێشنیاری گوێدرێژەکەی بەدڵ بوو، دەست بەجێ ڕازی بوو. کاتێک خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو و شەو داهات، چوار هاوڕێکە تەواو هیلاک و ماندوو بوون، لەدوورەوە



ڕوناکیەکیان بەدیکرد، گوێدرێژەکە ووتی: بێگومان دەبێت ئەوەماڵێک بێت با بڕۆین. کاتێک هەرچوار هاوڕێکە لەماڵەکە نزیک بوونەوە گوێدرێژەکە سەیری ناو خانوەکەی کرد، بینی مێزێکی پڕ خواردنی جۆراوجۆری لێیە و سێ پیاو لەدەوری دانیشتون، بەهاوڕێکانی ووت: دڵنیام ئەوانە دزن! پێویستە ڕێگە چارەیەک بدۆزینەوە دەریانپەڕێنین. پاش کەمێک لەبیرکردنەوە هەرچواریان لە پەنجەرەکە نزیک بوونەوە، گوێدرێژەکە هەردووپەلی پێشەوەی لەسەر پەنجەرەکە دانا، سەگەکە چووە سەر پشتی، پشیلەکەش لەسەر پشتی سەگەکە وەستا، کەڵەشێریش لەسەر سەری پشیلەکە وەستا، پاشان هەموویان بەیەک دەنگ کەوتنە هاوار کردن، گوێدرێژەکە بەهەموو هێزی کەوتە زەڕین سەگەکەش دەستی بە حەپە حەپ کرد، پشیلەکەش بە میاوان، کەڵە شێریش بە قوقە قوق. بە ئاماژەیەک لە گوێدرێژەکەوە هەرچواریان لە پەنجەرەکەوە بازیاندایە ژوورەوە، ئەوەش دەنگێکی گەورەی دروستکرد و پارچە شووشە شکاوەکانی پەنجەرەکە بەهەموو لایەکدا بڵاو بۆوە.سێ دزەکە پەشۆکان و وەک کەروێشک هەڵهاتن، وە لەدارستانەکەدا لەبەرچاو بزر بوون. پاشان چوار هاوڕێکە دەستیان بە خواردن کرد، ئەوەی لە دزەکان جێما بوو، پاشان نوستن بەڵام دزەکان لەدەرەوە



چاودێری خانوەکەیان دەکرد، چونکە واخۆیان دەهاتە پێش چاو، کە بونەتە گاڵتەجاڕی، کەبەو شێوەیە هەڵهاتن، کاتێک دزەکان بینیان ڕوناکی ماڵەکە کوژایەوە و پاش ئەوەی کەمێک خۆیان خافڵاند، سەرکردەکەیان فەرمانیدا بەیەکێک لەدزەکان کە بگەڕێتەوە بۆ خانوەکە تاوەکو بزانن دوژمنەکانیان کێن. دزەکە لە پەنجەرە شکاوەکەوە چووە ژوورە وە، کاتێک لەتاریکاییەکەدا دەگەڕا، دووشتی داگیرساوی بینی وایزانی پشکۆی ئاگردانەکەن بەڵام لەڕاستیدا چاوی پشیلەکە بوون، کە لە پڕێکدا شاڵاوی بۆ برد و بە چڕنوکەکانی بریندارى کرد، دزەکە ویستی لەدەرگاکەوە هەڵبێت سەگەکە قەپاڵێکی لێگرت، کاتێک دزەکە گەیشتە بەردەرگاکە گوێدرێژەکە جوتەیەکی قایمی تێسرەواند، کەڵەشێرەکەش بەدەنووک کەوتە سەرو گوێلاکی. دزەکە بەهەڵداوان خۆی گەیاندەوە لای هاوڕێکانی، پێی ووتن کە جادووکەرێک بریندارى کردووە وەخێوێک گازی لەقاچی گرتووە و وە گیانلەبەرێکی زەبەلاح جوتەیەکی لێداوە و چۆلەکەیەکی گەورەش بەدەنووکەکانی سەری کون کون کردووە. دزەکان لە ترساندا هەڵهاتن و ئەوشوێنەیان بەجێهێشت و هەرگیز نەگەڕانەوە.وە چوار هاوڕێکە بڕیاریاندا لەو خانوەدا بمێننەوە و بەرەو شاری بریهمە نەڕۆن.



# بەسەرهاتی کچەی کڵاو سوور

کەسانێک هەن هەر لە یەکەم بینینەوە خۆشەویستیان لەدڵا دەچەسپێت! مەیسون لەوانە بوو، منداڵە جوانە خاوەن کڵاوە سوورەکە، ئەو ناوەیان بڕی بەسەردا لەبەر ئەوەی کەس نەیدەبینی بەبێ ئەو کڵاوە جوانکیلەیە، مەیسون خەڵکی خۆشدەویست، خەڵکیش ئەویان زۆر خۆشدەویست، بەڵام نەنکی نازی زۆر دەدایەو لەهەمووان زیاتر خۆشی دەویست، هەر نەنکی ئەو کڵاوەسورەی بەدیاری بۆ هێنا بۆ ئەوەی هەمیشە لەیادی بێت، رۆژێک پێویست بوو مەیسون هەندێک میوەوخواردنەوە ببات بۆ نەنکی، لەبەر ئەوەی نەخۆش بوو، کاتێک دایکی ئەو ئەرکەی پێ سپارد ئامۆژگاریکرد رێگا سەرەکیەکە بگرێت کە دەیباتە ماڵی نەنکی لەپەڕی دارستانەکە، بەڵام مەیسون لەبەر خۆشی بینینی نەنکی هەڵەیکرد، بەڕێگایەکی دیکەدا رۆشت، لەناکاو سەیریکرد لەناوەراستی دارستانەکەدایە، گورگێکی برسی دڕندەی لێبوو، بەچاوە سورەکانی سەیریدەکرت، کاتێک مەیسونی بینی زمانی دەرهێنا، مەیسون ئەو دیمەنە ترسناکەی بینی، بەڵام نەیدەزانی گورک ئاژەڵێکی دڕندەیە، بۆیە نەترسا، گورگەکە ووتی بەمەیسون: بەم بەیانیە زوە بۆ کوێ دەڕۆیت؟ مەیسون بەئاسانی ووتی: من دەچم بۆلای



نەنکم، نەخۆشەومن هەندێک خواردنو شەرابی بۆ دەبەم بەڵکو تەندرستی باش بێت، گورگەکە پرسیاری ماڵی نەنکی کرد، ئاماژەی پێکرد، پیشانی دا، گورگەکە لەناخی خۆیدا ووتی: واو، کەواتە ئەمرۆ دوو نەچیری خۆشم هەیە، پێویستی سەرەتا لە نەنکەوە دەست پێبکەم، نەخشەی خڵافاندنی مناڵە ژیکەڵەکەی دارشت، هەتا لە ئەرکی یەکەم دەبێتەوە، گورگەکە ووتی: سەیرکە ئەم دارستانە چەند جوانە، سەیری ئەو گوڵە جوانانەکە، مەیسون دەستی بە چاوگێڕان کرد بە دەوری خۆیدا، بە راستی ئەو گوڵانە زۆر جوانن، دیمەنی خۆر چەند جوانە تیشکە ئاڵتونیەکەی بەناو چڕی دارەکاندا بڵاو بۆتەوە، دەنگی بولبولان چەند خۆشە بەسەر چڵە دارەکانەوە، مەیسون لەناخی خۆیدا دەیووت: باهەندێک گوڵ لێکەمەوەو بیبەم بەدیاری بۆ نەنکم، بێگومان نەنکم دڵخۆش دەبێت بەم گوڵە جوانانە، مەیسون ئەمەی لەناخی خۆیدا ووت: گوڵێک لەویۆ گوڵێک لێرە لێدەکاتەوەو کردیە چەپکێکی جوان، بەڵام گورگەکە بەرەو ماڵی نەنکە نەخۆشەکە کەوتە رێ، کە بینی لەسەر جێگاکەی راکشاوە، هێرشی کردە سەر، وقوتی دا، وچلەکانی نەنکی لەبەر کرد بۆ ئەوەی مەیسون بخەڵەتێنێت، مەیسون چەپکە گوڵەکەی هەڵگرت، کەوتە رێ بۆ ماڵی نەنکی، بەڵام سەرسام بوو دەرگاکە کرابویەوە، لەسەر خۆ چوە ژورەوە، سەیریکرد نەنکی لەسەر جێگاکەی خۆیەتی، هەموو گیانی داپۆشیبوو،



تەنانەت مەیسون دەمووچاویشی نەدەبینی، منالّە کلّاوسوورەکە ووتی: نەنێ، بەیانیت باش نەنێ، دایکم هەندێک خواردنی خۆشو شەرابی بەلەزەتی بۆ ناردویت بەڵکو چاک بیتەوە، تەندروستیت بۆ بگەڕێتەوە، بەڵام نەنکی وڵامی نەدایەوە، مەیسون خێرا چوە لای پەردەکان لایدان، بۆ هاتنە ناوەوەی تیشکی خۆر، بەڵکو نەنکە نوستوەکە لەخەو هەستێت، دووبارە ووتی: دەی نەنێ خۆشەویستەکەم، هەستە ئەم خواردنو خواردنەوەیە بخۆ، بەڵام بێدەنگ بوو، وڵامی نەبوو، مەیسون زیاتر لەجێگەی نەنکی نزیک بویەوە، لەناکاو بینی گورگەکە ددانەکانی جیرِدەکاتەوەو پەلاماری دەداتو مەیسونی قووت دا، سکی گورگەکە پڕبوو لەنەنێو مەیسون، بۆیە پێویستی بە خەو بوو، لەپاش ئەم ژەمە خواردنە قورسە، ڕاوچییەک لە دەراوسێکانی نەنە لەنزیک ماڵەکەوە تێپەڕی، سەیریکرد دەرگاکە کراوەتەوە، نائاسیی بوو لای، چوە ناو ماڵەکە، سەیریکرد گورگەکە لەسەر جێگەی نەنە ڕاکشاوەو پرخەیەکی بێزارکەری لێدێت، سەیریکرد سکی زۆر هەڵاوساوە، ڕاوچییەکە بەوریایو لەسەر خۆ نزیک بویەوە، چەقۆیەکی تیژی هێناو سکی گورگەکەی هەڵدڕی، کوتوپڕ مەیسون لەسکی گورگەکە هاتە دەرەوە،



بەگوێیدا چرپاندی: وەختبو لەترسا بمرم، ئاه! .. سکی ئەم گورگە نەفرەت لێکراوە چەند تاریک بوو، سوپاس ئەی دراوسێی باش، تکایە خێرا نەنکم رزگارکە، راوچییەکە بەردەوامبوو لەسک هەڵدڕینی گورگەکە، نەنکە بێچارەکەی دەرهێنا کە خەریک بوو بمرێت، راوچییەکەو مەیسون هاوکاری یەکتریانکرد لە پڕکردنەوەی سکی گورگەکە لەبەرد، گورگەکە لەخەو هەستا، راوچیو نەنەو مەیسونی لەبەردەم خۆیدا بینی، کاتێک هەوڵی وەستانو پەلاماردانیانی دا، نەیتوانی بەهۆی ئەو بەردە قورسانەی لە سکیدا بوون، کاتێک بەهەموو توانای هەوڵی هەستانی دا کەوتە سەر زەوی بێ جوڵەو مرد، راوچییەکەو نەنێو مەیسون پێخۆشحاڵبوون بەمردنی گورگە شەڕانیەکە، راوچییەکە خێرا پێستەکی لێکردەوە بۆ ئەوەی بیکاتە پاڵتۆیەکو لەسەرمای زستان رزگاریکات، بەڵام نەنە، ئەو خواردنەی خوارد مەیسون هێنابوی لەگەڵا شەربەتە خۆشەکە، وتەندروستی گەڕایەوە، بەڵام مەیسون، ئامۆژگاریەکەی دایکی هاتەوە یاد کە ووتی: لەسەر رێگا سەرەکیەکە نەبێت نەڕوات، بڕیاریدا لە داهاتودا ئاگاداربێت، بۆ ئەوەی بەو رێگایەدا نەڕوات دەچێتە ناودارستانەکە.



# چیرۆکی ورچە بچووکەکە

هەبوو نەبوو بوکەڵە وورچێکی بچووک هەبوو کە بەردەوام وون دەبوو، یەکەم جار لە دووکانی یاری منداڵان ئەو کاتەی چاوەڕێی دەکرد بکڕدرێ، ئەویش کەوتبووە پشت ڕەفەکانی دووکانەکەوە دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەک دۆزرایەوە جەژنی سەری ساڵ تێپەڕی و خاوەنی دووکانەکە شوێنی بوکەڵە وورچە بچووکەکەی گۆڕی و لە سوچێکی دوکانەکە بە تەنیا داینا، ڕۆژێکیان پیاوێک کە بە سەردانێکی بازرگانی هاتبوو سەردانێکی دووکانەکەی کرد و دەیوسیت دیارییەک بۆ کچە بچکۆلانەکەی بەرێتەوە بەڵام پیاوەکە بیری کردەوە کە دەبێ یارییەکە بچوک بێت بۆ ئەوەی شوێنێکی زۆر نەگرێت لە فڕۆکەکەدا، گەڕا هیچ شتێکی گونجاوی نەدۆزیەوە تا ئەو کاتەی بوکەڵە وورچێکی بچووکی بینی لە سوچێکی تاریکدا دانرا بوو، پیاوەکە وتی: ئەمە ئەو دیارییەیەک من بە دوایدا دەگەڕێم، پیاوەکە وای ووت و بوکەڵە وورچەکەی خستە گیرفانیەوە و سواری تەکسیەکەی بوو، بەڵام ڕێگاکە بەرەو فڕۆکەخانە زۆر قەرەباڵەخ بوو بە شێوەیەک چەند خولەکێک پێش فڕینی فڕۆکەکە پیاوەکە گەیشتە فڕۆکە خانە، کارمەندی فڕۆکەخانەکە بە پیاوەکەی ووت: ڕاکە ئەگەر تۆزێک پەلە

بکەیت ڕەنگە بتوانیت سواری فڕۆکەکە بیت، بۆیە پیاوەکە بە ڕاڕەووەکەدا بە خێرایی ڕایکرد و توانی فریای فڕۆکەکە بکەوێت پێش ئەوەی دەرگاکەی دابخرێت، بەڵام کاتێک کە لە فڕۆکەکە دانیشت  بیری لە بووکەڵە بچووکەکەی گیرفانی کردەوە و دەستی کرد بە گیرفانیدا و بینی کە بووکەڵە وورچە بچووکەکەی کەوتووە، وورچە بچووکەکە هەر لەو شوێنەی کە پیاوەکە لێی کەوتبوو مایەوە تا کاتی ئێوارە کاتێک کە کارمەندانی پاککردنەوە ئەو ناوەیان پاک دەکردەوە وورچەکەیان دۆزییەوە، یەکێک لەو کچانەی کە ئەو شوێنەیان پاک دەکردەوە چاکەتێکی ئیشی شینی لەبەردا بوو، وورچەکەی دۆزیەوە و ووتی: تەماشاکەن، ئەم بوکەڵە وورچە بۆ ئەو خوشکەزابچووکەم باشە کە ئەمڕۆ دێت بۆ لام، هەر بۆیە بووکەڵە وورچەکەی هەڵگرت و خستیە گیرفانی چاکەتەکەیەوە بەڵام ئەو کچە زۆر سەرقاڵ بوو کاتێک شەو ڕۆیشتەوە ماڵی خۆیان چاکەتەکەی خستە ناو ئامێری جل شۆرینەوە بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە وورچێک لە ناو گیرفانی چاکەتەکەیەتی، دوای تەواو بوونی شۆرینی جل و بەرگەکان، بوکەڵە وورچەکە زۆر پاک ببووەوە، کچە تێبینی بوکەڵە وورچەکەی نەکرد لە نێوان جلە شۆراوەکاندا، جلە کانی خستە سەبەتەکەوە تاکو بەیانی هاوسەرەکەی لە دەرەوە هەڵیان بواسێ تاکو ووشک ببنەوە، بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر هاوسەری کچەکە سەبەتەکەی هەڵگرت و بردی بۆ باخچەکە، بەڵام ئەو کاتەی کە ویستی جلە کان هەڵبواسێت، زەنگی تەلەفۆنەکە لێی داو پیاوەکەش سەبەتەی جلەکانی لە باخچەکەدا داناو ڕۆیشتە ژوورەوە تاکو وەڵامی تەلەفۆنەکە بداتەوە، هەر کە چووە ژوورەوە سەگێکی بچووکی بزێو قەپاڵێکی کرد بە وورچە بچووکەکەدا و بردی، سەگی بچووک حەز بەوە دەکەن کە شتەکان لە خاکدا بنێژن، ئەوەی کە سەگە بچووکەکە ئارەزووی دەکرد ئەوە بوو کە چاڵێکی بچووک هەڵکەنێ و وورچە بچووکەکەی تێدا بنێژێت بەڵام خاوەنی سەگەکە بینی کە سەگەکەی خەریکی هەڵکەندنی چاڵ بوو هاواری کرد نەکەی، چیت لەوێدا دۆزیوەتەوە؟ سەگە بچووکەکە وورچە بچووکەکەی فڕێداو بەرەو لای خاوەنەکەی ڕایکرد، دوای چەند خولەیێک

نەورەسێکی دەریا هات و بە دەنووکی وورچە بچووکەکی هەڵگرت و بەرەو دەریا فڕی، نەورەسەکان زۆر ئارەزوویان لە وورچەکان نەبوو دوای ماوەیەکیش بێزار دەبن لە هەڵگرتنی بوکەڵە وورچە بچووکەکان، کاتێک نەورەسەکە نەورەسێکی تری بینی لە ئاسمان دەنوکەکانی کردەوە تاکو سڵاوی لێبکات لەو کاتەدا بووکەڵە وورچە بچووکە لە دەنوکی نەورەسەکە ترازاو کەوتە خوارەوە بەرەو دەریاکە و کەوتە سەر سەکۆی کەشتیەکی بار هەڵگر، زۆرباشە زۆرباشە تەماشاکە چی لە ئاسمان کەوتە خوارەوە من پارێزگاری لێدەکەم لە کابینەکەی خۆمدا، ڕەنگە بەختێکی باشمان بۆ بێنێ، کاپتەکە وای ووت و بوکەڵە وورچە بچووکەکەی هەڵگرت و بردی بۆ کابینەکەی خۆی، کەشتیە بار هەڵگرەکە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک بوو لە دەریادا مابووەوە، تا لە کۆتایدا گەیشتە بەندەرەکە و گەشتەکەی کۆتایی هات، کاپتنەکە جانتاکانی پێچایەوە ڕۆیشت بەرەو بەندەری دەریاکە، بوکەڵە وورچە بچووکەکەی خسە گیرفانی چاکەتەکەیەوە و ڕۆیشت تاکو سەردانی ماڵی خوشکێکی بکات کە نزیک بوو لە بەندەرەکەوە، لەو کاتەی کە کاپتنەکە بەرەو ماڵی خوشکەکەی دەڕۆیشت خوشکەزا بچووکەکەی بەرەو کاپتنەکە ڕایکرد و ووتی: هیچ دیاریەکت بۆم هێناوە لەگەڵ خۆتدا، باوکم بیری چوو جاری پێشوو هیچم بۆ بهێنێ، کاپتنەکە پێ کەنی و بوکەڵە وورچە بچووکەکەی لە گیرفانی دەرهێناو بە کچە بچووکەکەی ووت: هیوادارم ئەم دیاریەت بە دڵ بێت.





# ئەو بوکەڵە وورچەی کە هیچ جل و بەرگێکی نەبوو

تۆمسن بوکەڵە وورچێکی بچووک و قشت بوو، لەگەڵ کورێکی بچکۆلەدا دەژیا کە هەمیشە بە توندی لە باوەشی دەگرت و ببوو بە کەسێکی زۆر خۆشەویست تا لە گەڵی بژێت، ئەو کچە بچکۆلەیە ناوی کاتیا بوو، هیچ کات پێی خۆش نەبوو تۆمسنی لێ دووربکەوێتەوە، تا ئەو کاتەی شەوێکیان تۆمسن فەروەکەی چڵکن ببوو و کاتی ئەوە هات بوو کە دایکی کاتیا بۆی بشوات، بەڵام کاتیا نیگەران بوو کە هێشتا فەروەکەی تەڕەو ناتوانێت لەگەڵ خۆی بیخەوێنێت، دایکی پێی ووت: ناتوانیت لەگەڵ خۆتی بیخەوێنیت چونکە هێشتا فەروەکەی تەڕە با بۆتی بخەمە جل شۆرەوە تاکو ووشک ببێتەوە، دوای ئەوەی کە بە تەواوی ووشک بووەوە تۆمسن لەسەر جێگاکەی کاتیا خەوی لێ بکەوێت، بوکەڵەیەکی زۆر دڵ خۆش

بوو، بەڵام بەیانی ڕۆژی دواتر کاتێک کاتیا چوو بۆ خوێندنگا پێویست بوو کە تۆمسن لەماڵەوە جێ بهێڵێت، سەرەتا تۆمسن بە دوای بوکەڵە و یاریەکانی تری کاتیا دەگەڕا تا لەگەڵیان بێت، بەڵام هەر کە کاتیا چووە خوارەوە یاریەکانی کاتیا دەستیان کرد بە قاقای پێکەنین، من ناتوانم تەماشا بکەم، زۆر شپرزەیت! بوکەڵە پەڕۆکە بە پێکەنینەوە وای ووت: نابێ ڕێگەی پێبدرێت، بوکە شوشە منداڵەکە بە قاقاوە وای ووت و ئاماژەی بۆ تۆمسن کرد و لەولاوە شەمەندەفەرە شینەکە فیکەیەکی لێداو ووتی: هەر چۆنێک بێت من بۆیە کراوم، بەڕاستی من زۆربە داخەوەم بۆت، بوکەڵە گاڵتەچیەکە لەلای خۆیەوە وای وت، تۆمسن نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە ئەوان باسی چی دەکەن دەستی دا لە فەروەکەی و دڵنیا بوویەوە کە دەستەکانی پاکن لە کۆتایدا لەوە زیاتر بەرگەی نەگرت و ووتی: بێزەحمەت من کێشەم چی یە کە وام پێدەڵێن؟ ئازیزم بە دڵنیا ییەوە دەزانیت! بوکەڵە پەڕۆینەکە چرپاندی، تۆ هیچ جل و بەرگێکت نییە؟ شەمەندەفەرە شینەکە ووتی: تۆ وورچێکی ڕووتی، هەموو یاریەکان جل و بەرگی خۆیان هەیە یاخوود بۆیە کراون وەکو من، ناتوانین یاریت لەگەڵ بکەین ئەگەر شتێک لەبەر نەکەیت، لە ناکاو تۆمسن زۆر هەستی بە گەمژەیی کرد و لە بیری خۆیدا ووتی هیچ کام لە بوکەڵە وورچەکانی دوکانی یاری منالەکان جل و بەرگیان لەبەر نەبوو بەڵام بۆ ئێستا ئەم یاریانە باسی دەکەن بۆیە  پێیانی ووت: بەڵام من هیچ جل و بەرگێکم نیە وە نەمزانیوە کە بوکەڵە وورچەکانی وەکو من  دەبێت جل و بەرگ بپۆشن، یاریەکان نەیان دەویست بێ بەزەیی بن بەرامبەر بە تۆمسن، هەر بۆیە هەوڵیان دا شتێک بدۆزنەوە تاکو تۆمسن بیپۆشێ، بوکەڵە پەڕۆینەکە پۆشاکێکی خۆی پێداو پێی ووت: ئەوە بپۆشە تا کاتیا لە خوێندنگا دەگەڕێتەوە، ئەم جل و بەرگە بۆ ئاهەنگەکان دەپپۆشم، هەربۆیە تۆمسن جل وبەرگەکەی پۆشی کە پڕ بەبەری بوو، بەڵام کاتێک کە تەماشای خۆی کرد لە ئاوێنەدا نەیدەتوانی خۆی بناسێتەوە لە ناو ئەو جلو بەرگەدا کە بە شریت و ئۆیە نەخشێندرابوو، هیچ شتێک ناتوانێت لە دونیادا ئەم جل و بەرگەم پێ لەبەر بکات وە من لە وە دڵنیام لە شتێک ئەویش ئەوەیە کە وورچ هیچ پۆشاکێک ناپۆشێت، بۆیە جل و بەرگی ئاهەنگەکەی بەگەڵە پەڕۆینەکەی داکەند و لە سوچێکدا دانیشت، بوکەڵە گاڵتەچی یەکە بە تۆمسنی ووت: من جل و بەرگێکی



زیادەم هەیە دەتوانی لەبەری بکەیت، بەڵام دەبێ لوتەوانە سوورەکەش بکەیتە لوتت خۆت دەزانی جل وبەرگی گاڵتەچی بە بێ لووتە سوورەکە لەبەر ناکرێت، تۆمسن جل و بەرگە کەی پۆشی و جارێکی تر چووەوە بەردەم ئاوێنەکە و تەماشای خۆی کرد و هاواری کرد، ئەمە خراپترە، لەم جل و بەرگانەیا زۆر پێکەنیناوی دەرئەکەوم، هەرگیز وورچم نەبینیوە بە لووتی سوورەوە، هەر بۆیە جل و بەرگەکەی داکەند و لوتە سوورەکەی لە لوتی لێکردەوەو جارێکی تر لە سووچەکەدا دانیشتەوە، من پۆشاکێکم هەیە کە بۆ هەموو کەسێک دەگونجێت، بوکەڵە مناڵەکە بە قاقاوە بە تۆمسنی ووت و قوماشێکی خڕی سپی دایە تۆمسن، تۆمسن ئەمەشی بە دڵ نەبوو  و هەر زوو دایکەند، شەمەندەفەرەکە لەلای خۆیەوە ووتی: دە کەواتە یەک شت ماوە تا بیکەیت ئەویش ئەوەیە کە وەک من جەستەت بۆیە بکرێت، شەمەندەفەرەکە بە ناو کەلو پەلەکانی کاتیا گەڕاو تاکو بۆیەی دەستەکانی کاتیای دۆزییەوە و دەستی کرد بە بۆیە کردنی تۆمسن.دوای تێپەڕبوونی نیو کاتژمێر، وورچێکی پەلکە زێڕینەیەی بە خەمبارییەوە بەرامبەر ئاوێنەکە وەستا، هەموو یاریەکان



پێیان ووت ئێستا باشتر دەردەکەویت بەڵام تۆمسن زۆر دڵنیا نەبوو ووتی: هیوا خوازم کاتیا ئەم شێوازەمی بە دڵ بێت، کاتێک کاتیا لە خوێندنگا گەڕایەوە و تۆمسنی بینی دەستی کرد بە گریان و بەدەم هەنسک دانەوە ووتی: چی بەسەر فەروە ئاڵتوونیەکەتدا هاتووە؟ دایکی کاتیا فرمێسکەکانی کاتیای سڕی و ووتی: واهەست ئەکەم کە کاتی ئەوە هاتووە کە تۆمسن بشۆیت، کاتیا تۆمسنی شۆرد بە ئاوو سابوون و دایکی تۆمسنی بردە دەرەوە تاکو ووشکی بکاتەوە، بە هێواشی تۆمسن لەبەر تیشکی خۆرەکە ووشک بووەوە، تۆمسن چەند بڕیارێکی گرنگی دا، یەکەمیان: بە خۆی ووت: مایەی شکۆمەندی نیە بۆ وورچێک کە بە گوێیەکانی بە تەنافی جل ووشک کردنەوە دا لەبەر تیشکی خۆر هەڵبواسرێت تا ووشک ببێتەوە، ئەمە هەرگیز نابێت جارێکی تر ڕوو بداتەوە دووەمیان: من فەرووەیەکی ئاڵتوونی زۆر جوانم هەیە جارێکی تر هەوڵ نادەم کە بە جل و بەرگ بیشارمەوە.

# بڵاوکراوەی نوێ و بەسود، ئێستا بڵاوکراونەتەوە

بۆ دەستکەوتنی بەتاك و بەکۆ: (٠٧٧٠١٩١٨٥٦٥ / ٠٧٥٠١٥٧١٨١٨)










